# ئاینی زەردەشت

نووسینی

دکتۆر عەلی شەریعەتی

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

شەهرام ڕەشید قادر


تفسیر

١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥

ناوی کتێب: ئایینی زەردەشت
ناوی نوسەر: عەلی شەریعەتی
ناوی وەرگێڕ: شەهرام رەشید قادر
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٦ک ٢٠٠٥ز
چاپکردنی: چاپخانەی پەروەردەی هەولێر
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٥٦٤ ساڵی ٢٠٠٤

التفسير
هەولێر - شەقامی دادگا
تەلەفۆن : ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
مۆبایل : ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢٩١
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی وەرگێڕ

خوێنەری بەڕێز !

ئەم نوسراوەی لەبەردەستتایە، وەرگێڕانی دەرسی سیانزەهەم و بەشێك لە دەرسی چواردەیەمی بەرگی دوەمی کتێبی (مێژو و ناسینی ئاییینەکان)ە، هی کۆچ کردو (دکتۆر عەلی شەریعەتی)یە سەبارەت بە زەردەشت، کە (٣٣) ساڵ پێش ئێستا لە (حوسەینیەی ئیرشاد) لە تاران پێشکەشی کردوە.
لەبەر بەپێزی باسەکەی بە پشتیوانی خوا بڕیارم دا بیکەم بە کوردی. ئەوەی کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە، کە (دکتۆر شەریعەتی) باسەکانی لەم کتێبەیدا نوسراوی ڕێزمانی نیە، بەڵکو لە کۆڕ و دەرسی قوتابیانی زانکۆدا گوتنیەتەوە، ئەوەی من کردومە ئەمەیە، کە لە زۆر شوێن دا گوتەکانیم وەك خۆی نەقڵ کردوە و، لە هەندێ شوێنیشدا ناچار بوم بە چەشنێك ڕستە و ماناکەی ڕێك بخەم، کە لەگەڵ ڕوحی خوێنەردا بگونجێ و تێگەیشتن لێی سانا بێ.. هەروا بۆ ڕون کردنەوەکان سودمان لە پەراوێز وەرگرتوە. لەگەڵیدا زۆر ماندو بوم، لە قۆناغی شەشی ئامادەیی و لەکاتی سەعیکردنی سەری ساڵیش دا هەر پێوەی خەریك بوم. بەڕێز مامۆستا (عزیز ئالانی) پیاچونەوەی دەقە کوردییەکەی کردوە، سوپاس و ڕێزم بۆی..

هیـوادارم بـەم وەرگێڕانـە بۆشـاییەك لـە مێـــژوی تێگەیشـــتنمان بـــۆ ئایینەکانی پێش ئیسلام لە ناوچەکەمان پڕ بێتەوە.. ئەمە یەکەم وەرگێڕانمـە و گوڵەباغەکانیش دڕکیان زۆرتر لـە گـوڵ پێوەیـە. هیـوادارم لـە هەڵـەکان ئاگادارمان بکەنەوە.

ئیتر پشتیوان بەخوا

شهرام
٢٠٠٢/١٠/١١ سلێمانی

# هاتن بۆ ئێران

دوای رۆیشتن لە هیندستان و هاتن بۆ ئێران، رووبەڕوی گیانی ئـایینێکی نـوێ و تایبـەت دەبینـەوە، کـە تـەواو جیـاوازە لـەو ئایینـەی لـە هینـد ناسیومانە، چونکـە گیـانی ئـایینی هینـدی زۆر قـوڵ و باڵادەسـتە، بـەڵام بەدبینە و نامۆیە بە واقیع. گیانی ئایینی ئێرانی روکـەش و سـانایە، بـەڵام واقع بین و روناك بینە.

بە بەراوردکردنی گشتی ئەم دوو گیانە ئایینی‌یە و ژماردنی سیفەتە باش و خراپەکانیان، هەر لـێرەدا، ئـەم وانەیـە فـێر بـین، کـە لـە لێکۆڵینـەوەی مەزهەبێك، مەکتەبێك، پەرتوکێك و کەسێك، بـەهێزی و لاوازی‌یەکانیشـی بە یەکەوە بگرین و بیناسین و باس بکەین، نەك هەر کە خـاڵێکی لاوازمـان بینـی بـۆی پینەکـەین و بەهێزەکانیشـی داپۆشـین و لایەنـە پەسـەندەکانی بشارینەوە، یان بکەوینە ژێـر کاریگـەری توانـا و دەسـەڵاتیەوە و سـەرجەم لاوازی‌یەکانی لەبەرچاو نەگرین، ئەمەیە سەرەتای ئەو وانە گەورەیـەی، کـە دەبێ لەم باسەماندا فێری بین.

## سەرەتای ئایین لە ئێران

سەرەتای کاری ئایینی لە ئێراندا، دەبێت بـە دەسـت پێکردنـی مێـژوی (ئاریەکان) لە ئێراندا، ئاوێتە بکرێت. پێش هاتنی ئاریەکان بۆ ئـێران، لـەم سەر زەمینەدا هۆزە (بومی)یەکان دەژیان. (هەروەك چۆن لە هیندسـتان دا،

ئێستاش هەر هەن و بە چینی ناپاکەکان[1] ناسراون)، کە هەندێك بە ڕەش پێستەکانیان دەژمێرن و، دەڵێن هەر لەو هۆزانەن کە دوای ئیسلام بەشی هەرە زۆریان لە باشوور ژیانیان بەسەر دەبرد و، لەگەڵ ئەفریقیادا پەیوەندیان هەبوو.

بە هەر حاڵ لە بونی هۆزە بومی‌یەکانی ئێران (پێش هێرشی ئاریەکان) ناتوانین بەگومان بین. ئیستاش هەندێ لە تایبەتمەندی‌یەکانی ڕەگەزیی، کە لە دەوروبەری کرمان هەیە، پیشاندەری (یان یادگاری) نژادی دانیشتوانی کۆنی نائاریەکانە.

## بومی‌یەکانی ئێران و ئایینەکەیان

لەبارەی هۆزە دەشتەکیەکان(واتە بومیەکان)ی ئێران، هیچ زانیاریەکمان نی‌یە، جگە لە هەست و گومان ناتوانین لەبارەیانەوە داوەری بکەین. بە نموونە: ((کە لەبەر ئەوەی کۆچەری بوون، باوەڕیان بە (فتیشیسم) یان (ئەنیمیسم) [2] یان ... بووە. یان بەشێوەیەکی تەواو پەرەسەندو بتیان پەرستوە، یان خۆیان بە پەرستنی دیمەنە ڕوکەش و دیارەکانی سروشتەوە خەریك کردوە، بەڵام ڕاستەوخۆ و بەدڵنیاییەوە ناتوانین ئەمە بلێین، چونکە قەومێك بوون و تواونەتەوە و نەماون. هەروەها بەهۆی سروشتی کۆچەریشیانەوە، نەیانتوانیوە ئایینێکی پێشکەوتووی نەگۆڕ هەڵبژێرن، هەر

---

(١) چینی ناپاکەکان: واتە ئەوانەی سەر بە هۆزی ناریەکان نەبوون و پێش ئەوان لە هیندستان دا هەبوون، واتە هۆزە بومیەکان(کۆچەریەکان). -وەرگێڕ-

(٢) فتیشیسم (Fetishism) : بت پەرستی.
ئەنیمیسم (Animisme) : ئەرواح پەرستی. -وەرگێڕ-

بۆیە لە هێرشی لەناکاوی ئاریەکان (کــە بــەهێز و شــەڕکەر و زۆر چــالاك و توانا بە پێشکەوتن بوون) توانەوە.

ئاریەکان، دوای گرتنی هیند و ئێران، فەرهەنگ و ژیار و رژێمی سیاسی و کۆمەلآیەتی گەورەیان بە بوون هێنــا. ئاکــامیش چــەندین ئــایینی بــالآو گەورە بــە مێــژو دەبەخشــن، کــە (ڤیدایــی) و (بودایــی) لــە هیندســتان و (میــترایی) و (زەردەشــتی) و (مانــەوی)[1] و (مــەزدەکی)[2] لــە ئــێران دا جێگەی ئاماژەن. ئاریەکانی ئێران و هینــد، کــە لەیــەك ڕەگــەز و نــەژادن، لەکاتێکی نزیك لە یەکتر بۆ ئەم دوو سەر زەمینە (ئێران وهینــد) دێــن. لــە هیندستان دا ئایینی وەها بە بون دێنن، کە خالّی بەرانبەری ئایینێکن، کــە براکانیان لە ئێران دا دایانمــەزراندوە. ئــەو فەرهــەنگ و ژیــارەی ئاریــەکانی ئێران پێکیان هێناوە، پێچەوانەی فەرهــەنگ و ژیــاری براکانیانــە، کــە لــە هیند دروستیان کردوە، ئەم هەموو جیاوازییە بۆچی؟

---

(١) مانەوی: پــێڕەو و ئــایینی (مــانی) وێنــەکێش، کــە لــە ســەردەمی (شــاپوری یەکــەم) بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کرد، کتێبێکی بەناوی (ئەرژەنگ) هێنا، کە نەقش و نیگــاری زۆر و جۆراوجــۆری تیــابوو، بەهۆیــەوە بانگــەوازی پێغەمبەرایــەتی کــردووە. لــەم پــەڕاوەدا بــۆ پیشاندانی بیروباوەڕەکــانی خــۆی ســەبارەت بــە دروســت بــوون و گــەردون، دیمــەن و وێنــەی هەمەچەشنی کێشاوە، بۆ ئاسان تێگەیشتنی هەوادارانی. ئایینی ئەو تێکەڵەیەك بووە لە بــیر و ئەندێشە و باوەڕی (زەردەشتی) و (یەهودی) و (عیسەوی).. -وەرگێڕ-

(٢) مەزدەکی: پێڕەو و ئاییــنی (مەزدەك)، ناوی ڕێڕەوو ئایینێکە، کە مەزدەك لە سەردەمی (قوباد پادشای ساسانی) دا هێنای و بنەماکــەی لەســەر هاوبەشــەکی ســەروەت و ســامان و یەکسانی خەڵك بوو. هەوادار و شوێنکەوتەی زۆری پەیداکرد، تەنانەت (قوباد)یشــی بــۆ لای خۆی ڕاکێشا، بەڵام گەورەکانی ئێران بەرهەڵستیان کرد. ئاکام لە ســەرەتای هاتنــە ســەرکاری (ئەنوشیروان) لەگەڵ چەندین هــەزار کــەس لــە شــوێنکەوتوانی کــوژران. -وەرگــێڕ-

سەرچاوە: فرهنگ فارسی عمید.

لەبەر ئەوەی کاتێ ئاریەکان دەچنە هیندستانەوە، سەر زەمینێك دەبینن، تەڕ و بە پیت و بەرەکەت، داپۆشراو بە دارستان و خاکی بەپیت و ڕێژەن و روباری فراوان و پڕ ئاو، بەڵام کاتێ دێنە ناو ئێرانەوە، روبەڕوی خاکێکی وشك و کەم ئاو و هەتاوی گەرم و کشتوکاڵی نابووت دەبنەوە.

(شپینگلەر Spengler) دەڵێت: ((شارستانێتی تەنها لە خاکێکدا سەرهەڵئەدات، کە دانیشتوانەکانی بە تێکۆشانی فکری و لاشەی سەخت و دژوار بژین و، خۆراکیان دەستگیر ببێ و ژیان بەسەر بەرن)).

هەر بۆیە گەر مرۆڤێك گەیشتە سەر زەمینێك، کە بەبێ هیچ کار و تێکۆشانێك هەرچی ویست بۆی مسۆگەر بێت، هەرگیز ناتوانێت، شارستانیەتێکی گەورە بنیات بنێت. خۆ ئەگەر لە خاکێکدا چاوی کردەوە، کە بە زۆرترین کار و کۆشش نەگەیشتە سەرەڕێی پێشکەوتن و بەهیچ ئاکامێك نەگەیشت، ئەوا بنیات نەری ژیارێکی گەورەش نابێت. نموونەی ئەوەی بێ هیچ کارکردنێك هەموو شتێکی هەبوو، وە پێویستی بە چارەسەرکردن و بیرکردنەوە و کەرەسە و پیشەسازی و دۆزینەوە و تێفکرین و تەکنیك نەبو، دانیشتوانی باکوری ئەوروپا و ئەمریکایە، کە چەندین سەدە لە باکوری ئەوروپا و ئەمریکا ژیانیان بەرێ کرد، هەرگیزیش ژیارێکی گەورەیان بەبوون نەهێنا. نموونەیەکی تر دانیشتوانی نیوەگۆی باکور و سیبریایە، کە لە سەدەکانی کۆندا، بۆ بنیات نانی هیچ جۆرە ژیارێك؛ سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا.

ئەم جیاوازی و جۆراوجۆرییە لە ئێران و هیندستانیش، تا ڕادەیەك بە دیاردەکەوێ و بۆتە هۆی ئەوەی کە هاونژادی، دوو جۆرە ئایینی بە بوون هێنابێت، ئاریەکانی هیند، لەگەڵ خاکێکی بە پیت و ژیانێکی ئاسودە

ڕوبەڕوون. هەروەك مرۆڤێك کە لەلایەنی ماددی و ئابووری لە خۆشگوزەرانی تەواودایە و، نانی بێکار و زەحمەت بەدەست دێنێت. ئەمەش خۆی لە خۆیدا وای لێ دەکات بەدوای هۆنراوە و مۆسیقا و هونەر و هەستە بەرز و ڕازاوەکان و خەیالاتی چەوت و لاڕێ(انحراف)، یان ڕاستیدا دەڕوات و لە واقیعیەکانی ڕۆژانە و بەردەوامی ئابوری و مادی ژیان ڕادەکات. لەبەر ئەمەیە هیندیەکان دەست بەتاڵ دەبن و کاتی زۆر و دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێ، کە بەرزترین بەرهەمی ئەدەبی و سۆز و ناسکترین هەستە شاعیریەکان و جوانترین بەرهەمی مۆسیقی و هونەری و، ڕازاوەترین بەرهەمی نیگارکێشی و بیناسازی بەدی بهێنن. لەلایەکی ترەوە قوولترین سۆزە عیرفانیەکان و، هەروەها سۆفی و عیشقیەکان و، بەرزفڕترین ئیدیاڵ و خەیالاتی مرۆیی لە فەرهەنگی (هیند)دا دەربکەوێ، کە نموونەیان دەبینرێ لە ژیانی (بودا) و قوتابخانەی (ڤیدایی)دا.

بەڵام ئاریەکانی ئێران لەسەر زەمینێکی پڕ بەرگری و سەخت و بێئاو و سەوزایی نیشتەجێن، کە دەرفەتی دەرونگەرێتی‌یان نی‌یە و، کاتێکی بەتاڵ شك نابەن، کە بەرەو هونەر و زیرەکی و زیبایی[1] و عیرفان کەمەندکێشیان کات.

## سێگۆشەی قەومی ئاریەکانی ئێران

ئاریەکانی ئێران بەسەر سێ هۆزی گەورەدا دابەش دەبن: بەشێکیان لە خۆرهەڵات (خوراسان) نیشتەجێ بوون و پارتیەکانیان پێکهێنا. بەشێکی

(١) زیبا : جوانی

تریان لە باکوری خۆرئاوا (ئازەربایجان تاکو کوردستان) نیشتەجێ بوون و بە (ماد)ەکان ناویان دەرکرد. سێیەم بەشیش لە دەوروبەری فارس و ناوەند و باشوری ئێران مانەوە و بە (پارسەکان) ناوبانگیان دەرکرد.

یەکەمین زنجیرەی شاهەنشاهی و ئیمپراتۆری، میدیەکان بە بوونیان هێنا، کە لە دواییدا کوروشی پارسی (کە لە دایکەوە میدیا بوو)، ئیمپراتۆری (میدیا)ی ڕوخاند و حکومەتی دایە دەست هۆزی پارسەکان (کە هەخامنشییەکانی سەر بەخێزانە فارسەکان بوون).

پارسەکانیش بە هێرشی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) شکست دەخۆن و، بۆ ماوەیەك کاروباری حکومەتی ئێران لەژێر دەسەڵاتی سلۆکیەکان (جێنشینانی ئەسکەندەر) دەمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار قارەمانانی پارتەکان (کەسانی وەك تیرداد و ئەشك) دژی سلۆکیەکان رائەپەڕن و داگیرکەری یۆنانی لە (ئێران) دا، لە ڕەگ و ریشەوە هەڵدەکەنن و حکومەتی (ئەشکانیەکان) پێك دەهێنن. حکومەتی ئەشکانی نە لە (میدیەکان)ە و نە لە (پارسەکان)، بەڵکو لە خۆرهەڵاتیەکانە (واتە پارتەکان). پارتەکانیش ئایینی زەردەشت بە ئایینێکی میدیای و پارسی دەناسن (لەبەر ئەوەی ئایینی زەردەشت لە ئێران دا، بەهۆی -ویشتاسب- برەوی سەند و باوکی ویشتاسبیش هەخامنشی بوو). ئەشکانیەکانیش موبەدەکان[1] (روحانیەکانی خاوەن دەسەڵات بەسەر جەماوەردا) سەر بە دەسەڵات و لایەنگری هەخامنشیەکان دەبینن، هەربۆیە گرنگیان پێ نادەن و کاروبار بە پێشەوا و مەلاکانی ئایینی زەردەشتی ناسپێرن و هەوڵی

(١) موبەد: مەلا، پێشەواکانی ئایینی زەردەشت، روحانیەکانی دەسەڵات دار بەسەر جەماوەردا.

کەنارگرتنیان دەدەن. ئاکام موبەدەکانی ئایینی زەردەشت، بەتوندی بەرهەڵستی حکومەتی (ئەشکانی) دەکەن و بەناوی دینەوە گەلیان لیّ هان دەدەن. بەرەبەرە شۆڕشی دژە ئەشکانی لە ئێران دا پێ دەگرێ، کە ناوەندەکەی پارسە[1]، پارس مەرکەزی پێشەوایانی زەردەشتی و ناوەندی حکومەتی هۆزی هەخامنشیەکانە.

## راپەڕینی دژە پارتی

راپەڕینی دژە ئەشکانی، کە بە هاندان و راگەیاندنی مەلا، یاخود روحانیەکانی زەردەشتی پێ دەگرێت، فراوان دەبێ و جنێو و نارەزایەتیەکان تادێ فراوانتر دەبێ، کە تاوانی پارتیەکان (بێدینیەیە) و ئیتر ئەوان بێگانەن و دوژمنی تورانی.

ساسانیەکان، کە بە هاوکاری و یارمەتی جەماوەری (پارسی) و رابەرایەتی روحانیەکان بە حکومەت گەیشتبوون، وەك هەر حکومەتێکی تازەپێگرتوو، کە حکومەت (یان یاسای حکومەتەکان)ی پێشتر بە پووچ دەژمێرێ و بە تاوانباریان دادەنێ و سەرۆکەکانیان بە گاڵتەجاڕ دەگرێ، پارتیەکانیان بە بێگانە و بێدین تاوانبار دەکرد. هەروەکو چۆن هەخامنشیەکان سیمایەکی ناشیرین و ترسناکیان بە (زوحاك)ی کۆتا پادشای میدیەکان دا، کە بە زوحاکی مار لە سەر شان ناساندیان.

کوڕانی (ساسان خوتای) -روحانی پەرستگای حەوز و موفتی گەورە و روحانی گەورەی ئێرانی ئەوکاتە- بە یارمەتی و هاودەستی پێشەوایان و

(١) باشوری ئێران کە ئێستاش لەوێدا هەن و ساڵانە ڕێو ڕەسمی ئایینی خۆیان ئەنجام دەدەن. -وەرگێڕ-

باوەڕدارانی زەردەشتی، ڕاپەڕینێکیان بەرپاکرد لەسەر بنەما و بۆ زیندوکردنەوەی ئاینی زەردەشت، ژیاندنەوەی دەسەڵات و هێزی روحانیەکان (کە نوێنەرانی ئاهورامەزدان لە زەویدا) و بە بەرزنرخاندن و شانازیکردن بە هەخامنشیەکانەوە، کە پارتیەکانیان بە تەواوی لەناوبرد.

حکومەتی ساسانیەکان، حکومەتێکی نەتەوەیی-ئاینییە. نێوانی ئەم حکومەتە و حکومەتی صەفەوی (لە هەر لایەکەوە) وێك چوونێکی سەیر هەیە. ڕاپەڕینی سەفەویەکان -هەروەك چۆن لە (شیعەی عەلەوی و شیعەی صەفەوی)دا باسم کرد-[1] لەسەر بنەمای (نەتەوە و مەزهەب) بوو، هەروەها ساسانیەکانیش لەسەر بناغەی ئەم دوو دروشمە (نەتەوە و مەزهەب) رادەپەڕن.

پاشاکانی صەفەوی کوڕانی (شێخ صفی الدین ئەردەبیلی) روحانی گەورەن، ساسانیەکانیش کوڕانی (ساسان خوتای) موفتی پەرستگای حەوز (گەورەترین پەرستگای پارس) و پێشەوای تەواوی روحانیەکانی ئێرانن.

ئاینی زەردەشت، کە لە سەردەمی هەخامنشیەکان دا ڕۆڵ و دەسەڵاتیان نەبووە (لە روانگەی منەوە لە کەمایەتیدا بوون). هەروەها ئەشکانیەکانیش روحانیەکانیان بە بەرز نەدەگرت و گرنگیان پێ نەدەدان. لە سەردەمی ساسانیەکان دا بەرەو گەشەسەندن و فراوان بوون دەچن و، بنەما ئاینییەکان بەرەو بوژانەوە دەڕۆن و بیروباوەڕ و ڕێ و ڕەسمی نوێ بۆ ئاینی زەردەشت زیاد دەکرێ. ئاڤێستا (کتێبی زەردەشتیەکان) کۆ و نوێ دەکرێتەوە، پەرستگای گەورە و فراوان دروست دەکرێن و ئاگر دادەگیرسێت

(١) باسێکی سەربەخۆیە و لە دەرسێکدا باسی کردووە. -وەرگێڕ-

و زەوییەکی زۆر (هەتا پێنج یەکی تەواوی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئێران) وەقفی پەرستگاکان دەکرێن.

## ئایینێکی پوچەڵ و گەندەڵ

بڕیاردان و یارمەتیدانی دەسەڵاتدارانی ساسانی، بۆ دروست کردنی پەرستگا و نزیك بونەوەی روحانیەکانی زەردەشتی لە فەرمانڕەوایانی ساسانی، حکومەتێك بە بوون دێنێ، بە چنراوی (ئایینی سیاسی) واتە (ساسانی-روحانی). حکومەتێك، کە ئایینی زەردەشتی بە ئەوپەڕی لوتکەی هێز و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی دەگەیەنێت، بەڵام لە هەمانکاتدا لە دەرون و واتا و ناوەرۆك و هەقیقەت و گیان و مەبەستی سەرەکیدا، زۆر زیاد تووشی داڕمان و بەبەردبوی دەکات. ئەمەش دروست ئەو دۆخەیە، کە لە سەردەمی (صەفەویەکان) بۆ شیعە و شیعەگەرێتی دێتە پێش، چونکە صەفەوییەکان توانا و دەسەڵاتی شیعەیان (وەك شیعەیەك کە ئاوات و ئارەزوی کۆمەڵانی خەڵك بوو، مێژوەکەشی هەزار ساڵ بەرگری و راپەڕین و جیهاد و شەهیدی و ئازادی بوو) کردە کەرەسەی دەستی سیاسەت و تێڕوانینە بەرژەوەندیە دەسەڵاتیەکانی خۆیان.

لە روکەش دا پشتیان بە روحانیەت و موقەددەساتی مەزهەبی شیعە بەست و، پێیاندا هەڵدا و رازاندیانەوە و بەرێزیان کرد. بەڵام لە ڕاستیدا (ستەم)یان کردە پۆشاکی لەخواترسان و پاکژی و پارێزگاری، کە بە گوتەی (ڕادهاکریشنان) گەورەترین کارەسات کاتێکە، کە ستەم و زۆرداری جل و بەرگی پاکێتی ئەپۆشێ. هەرکاتێ (ستەم) لە بەرانبەر (هەقیقەت) دابنرێ، ئەوە ستەم و زۆردارییە، کە، وەکو مۆرانە هەقیقەت و ڕاستی دەخوات و لە

ناوەرۆکەوە دەیرزێنــێ و گــەندەڵی دەکـات. ئیـتر ئـەو کاتــە نــە دەتوانــرێ بناسرێ، وە نە بەرهەڵستی بکرێ و، نە دەشکرێ دەست بۆ هیچ کارێکی تــر ببرێ، تەنانەت ناشتوانرێ (هەقیقەت) و (دین)یـش (وەك هەقیقــەت و دیــن پێکەوە) بناسین و لێك بدەینەوە.

ساسانیەکان مەزهەبی زەردەشتی‌یان بەم شــێوە رێکخســتن و دووربینــی و بیرکردنەوەیە دارِشت، کە لە راستی‌دا کردیانە ئایینێکی پوچەڵ و گــەندەڵ و ناپەسەند و رِەق و رِەچیاو و لە ئامانج لادراو. وەك پلەیەکیش سپاردیان بـــە روحانی‌یە پێشــەواکان و حکومــەتی سیاســی ساســانیەکان، بــۆ ئــەوەی لــە خزمەتی بەرژەوەندی‌یەکانی ئەواندا بخولێتەوە و پیشاندەری دەسەڵاتی ئــەوان (ساسانیەکان) بێت. بــەوەش ئــاییـنی زەردەشــتی، جۆرێــك پوکایــەوە، کــە راپەرِینەکانی تازە سەرهەڵداوی مانی و مەزدەك (دژی ئــاییـنی زەردەشــت)، پێشوازی‌یەکی گەرمی لەلایەن کۆمەڵانی خەلکەوە لیّ دەکرێ. لــە ئاکـام دا بینای بۆش و لەرزۆکی (ساسانی- روحانی)، بــە یەکــەمین گــورزی ئیســلام دائەرِمێ، لە کاتێکدا لە لوتکەی دەسەلات و هێزدان، بەڵام لـــە نــاوەرۆك و بناغە و رەسەنێتیدا دا پوچەڵ و گەندەڵ و بۆشە.

ئەگەر ئیسلامیش نەهاتبایە، ئێرانیەکان پاڵیان دەدایە مەزدەك و مانی. ئەگەر مەزهەبی مەزدەك و مــانیش (لــەنێوان جــەماوەر و خوێنــدەواران)دا پەرەی نەدەسەند، ئێران پێش ئیسلامبون دەچــووە ئــامێزی مەســیحیەتەوە، چونکە ئیتر رێبازی زەردەشت شایانی مانەوە نەبو. بەلگەشمان ئەمەیــە، کــە لە پێش هاتنی ئیسلامدا، مەداین (پایتەختی دەسەڵاتی ئــاییـنی زەردەشــت و دەسەڵاتی رژێمی ساسانی)، بوبووە مەرکەز و ناوەندی مەزهەبی جیـــهانی مەسـیحی‌یەت. ئەگــەر ئیســلامیش لــە بەرانبــەر ئــەم فــراوان خوازی‌یـــە

بەردەوامەی مەسیحی‌یەکان ڕانەوەستابا، ئەوا مەسیحیەت، ئێرانی زەردەشتیشی هەڵدەلوشی.

## یەکسانی ئایینی ئاریەکانی سەرەتای هیند و ئێران

گوتم کە ئاریەکانی ئێران، ڕووبەڕووی سەرزەمینێك دەبنەوە، پێچەوانەی ئەو خاکەیە، کە هیندیەکان تیایدا دەژین. بەڵام کەم ئاوی و وشك سالی و سەختی چینەکانی زەوی، ڕێ لە ئاریەکانی ئێران ناگرێ، کە بیر و کار و تەکنیك نەخەنە گەڕ و دەستەوسان دانیشن. ئەمەیە کە دەبینین ئاریەکانی ئێران، هەر کە دێنە خاکی ئێرانەوە، بە خێرایی لە شێوەی هۆزی شوانکارەیی و خێوەت نشینی‌یەوە، دەگۆڕێن بەرەو قۆناغی کشتوکاڵی و نیشتەجێبوون، کە ئاکام لادێ نیشنی و شارنشینی لەمێژووی ئێران دا بە بوون دێنن. ئەگەر نێوان ئاریەکانی بەرایی (هیند) و (ئێران) لە سەرەتای هاتنیانەوە بۆ ئەم دوو سەرزەمینە، لێك چوون ببینین، شتێکی سەیر نی‌یە، چونکە هەردوولا لە یەك ڕەگەز و ڕیشە و لەیەك جێگە و پێگەوە هاتوون و گەیشتوون بە خاکی جیاواز. کەرەسە و پێداویستی جۆراوجۆر و شێوەی چینەکانی خاك، هەمە چەشنیان دەکات و شێوەی جیاجیا بە ئاین و هونەر و فەلسەفەیان دەبەخشێ.

مێژو پیشانی دەدات کە کۆمەڵەی دەزگای (الهە) واتە خواکانی هیند (لە ئایینی ڤیدایی‌دا) لەگەڵ کۆمەڵە خواکانی ئایینی میترائیسم هاوشێوەیە. لە هیند (میترا)[1] خوایە، لە ئێراندا

---

(١) میترا: واتە خوای خۆشەویستی و ڕەحمەت و میهرەبانی و زەوی، ناوی یەکێکە لە خواکانی هیند. وەرگێڕ-

(میهر)[1]، لەوێ (هندستان) (دێو)[2] خوایە و لێرەش -واتــە ئـێران- هــەر (دێو) بە خوا دەزانن. لەوێ و لێرە -هەردوو- (ڤارونــا)[3] خوایــە. تــەواوی خواکانی هەردوو ئایینی ڤەدایی -لە هینــد- و میهرپەرســتی -لــە ئـێرانی پێش زەردەشت- یەکێکن. بنەمای میهرپەرستی، یان (میترائیســم) لەســەر ئەم باوەڕەیە، کە (میهر) خوای گەورەیە و خواکانی تر بچوکترن لەو.[4]

میترائیسم لەسەر بنەمای ئاگر و پەرستشی هێزە سروشتیەکان -وەك بــا و زریان، سەوزایی و بەهار، ئاسمان و شــاخ و دارســتان و شــەو و...هتــد،- هەروا خەریك بوون و سەرگەرم بوون بە سیحر و جادوگەریەوەیە. ئەمانــەش پێویستیان بە پەرستشی هێزە سروشتیەکان و، باوەڕ بوون بە گیانــە پیــس و پاکەکان -کە کارگێڕانی جیهانن- هەیە.

جادوو (سیحر)، بریتی‌یە لــە کۆمــەڵێ کــار و کــردەوە، کــە مــرۆڤ بــۆ پەناگرتن لە گیانە پیسەکان و هاتنی راکێشــانی گیانــە پاکــەکان ئــەنجامی دەدات. گرنگترین کردەوە، بۆ ڕاکردن و ڕامکردنی گیانە خراپ و چاکــەکان، قوربانی کردن ونەزر و تەنانەت تاوانی گەورە و فراوانە، کە جادوو هەمیشــە لەگەڵ تاوان و جینایــەت هــاوڕا و هــاوڕێ بــووە. تەنانــەت لــە ســەدەکانی

(١) میهر: ناوێکی یەکێکە لە خواکانی پێش ئایینی زەردەشت و یەکێکە لە خواکانی خــۆر، واتە لە خۆردا جێگەی هەیە. -وەرگێڕ-

(٢) دێو: شەیتان، یــان مەلیکــە تاووســی یەزیدیــەکان، هــەمان بیروبــاوەڕی میترائیــەکانی هندوستانیان هەیە. وەرگێڕ-

(٣) ڤارونا: خوای ئاسمان.

(٤) بە پێچەوانەی هندەوە کە لەوێ (هند) ڤارونا خوای ئاسمانــە کــە لــە زمــانی (ڤارونــە) بەواتای (معلق) دێت و بەخوای گەورە حسابە، بەڵام لە ئێران (میهر) کە لــە هندوســتانیش دا هەر یەکێکە لە خوا گەورەکان- نەکەوێتە بەر سپاس و گــەورەیی و کرنــوش و پەرســتش و دەبێتە یەکێك لە خوا مەزنەکان. -نوسەر-

ناوەڕاست، تەرمی چل منداڵی کەمتر لە چل رۆژەیان لە مینبەری کەنیسەیەکی چۆلکراو لە (وەرسا)ی دۆزییەوە، کە بەڵگەیە لەسەر تاوان و تاوانکاری جادوگەری. بە پێچەوانەی ئەوەی، کە کۆمەڵناسی -وەك دورکیم- باسی لێوە دەکات، کە گوایە لەنێوان جادوگەری و ئاین دا هیچ جیاوازییەك نییە. ئاشکرایە، کە جادوگەری لایەنی فەردی و دژە کۆمەڵایەتیە، بەڵام ئاین دژی تاك پەرستی و هەمیشەش کۆمەڵایەتیە. هەر ئەمەیە کە جادوگەری -نەفرەت لێکراوی شەرع و ئاین و ویژدانی گشتییە- هەردەم نهێنی و شاراوە لە کەنار و تاریکی و گوناهدایە، لەکاتێکا ئاین بەردەوام کۆمەڵایەتی بووە و دەبێ.

## جادوگەری بنەمای میترائیسم

یەکێك لە بنەماکانی میترایسمی، کە ئەمڕۆ بە بەرز و بەڕێز دەزانرێ - چونکە کۆنە و بە ڕابردووەوە پەیوەستە، لامان گەورەیی پەیداکردوە. دروست هەروەك گوندێك، کە لە دورەوە خۆش و جوان دیارە، بەڵام کە نزیك دەبێتەوە و دەچێتە ناوی، وانیە و پێچەوانەی شێوەی یەکەم دەرئەکەوێ و، لەو هەموو جوانی و شکۆییەی، کە لە دورەوە دەمانبینی هیچ بەجێ ناهێڵێت- ئەمە جادوگەریە. میترائیسم لەسەر بنەمای پەرستشی ئاگر و مێهرە، (مێهر) -واتە ئەو خوایەی کە لە خۆردا پێگەی هەیە، نەك خۆر خۆی- و بنەما و ڕیشەکەشی بە جادوگەرەوە گرێ ئەدات، کە ناگونجێ لە کۆمەڵگەیەکدا جادوگەری هەبێ، بەڵام کەسی جادوگەر نەبێ. ئەوەی شەوق و حەز و هۆش و توانای زیاتری هەبێت، تەنها بە خوێندنەوە و زانست -بەس بەمانە پشت بەستن- ناتوانێت لەسەر جێگەی جادوگەر دابنیشێت و

ببێ بە سیحرباز. جادوگەری و ئایینەکانی کۆن، بە شێوەی ڕێکخراوی ڕەسمی میراتی بەڕێوە دەبران و، سیحربازان کارگێڕ و سەرپەرشتکارانی کاروباری ئایینی و، پەیوەندیکاری نێوان مرۆڤ و خواکان بوون. (ئەمە شانازی ئیسلامە کە مەودای نێوان -خالق و مەخلوق-ی لابردوە و نیزامی میراتی تێك و پێك شکاندوە- ئەرزش و پلەو پایەی هەر جادوگەر و سیحربازێك لەسەر بنەمای تەقوا و زانست نەبوو، بەڵکو لەسەر بناغەی خوێن و زات بوو، کە بە میرات بۆی مابۆوە و پێشکەشی ڕۆڵەکانی دوای خۆی دەکرد. بۆ کەسانی تریش -گەرچی زیرەك و باشتر بونایە- نەدەگونجا و بۆیان نەبوو بەو پلەو دەسەڵاتە بگەن.

لە میترائیسم دا، ئەسڵ بوون و گەورەیی بوون بۆ پێشەوا و موغان و روحانیەکانی گرێدراو بە ئایینی مێهرپەرستیەوە بوو -هەروەك لە (بەرەهمەنیزم)[1]، بەس بۆ بەرەهمەن- کە بۆ جێبەجێکردنی ڕێ و ڕەسمی کاروباری مەزهەبی، وزە و توانای زۆریان هەبو. تەنانەت خەڵکی بێبڕوا پێیانیش بەهۆی گەورەیی و ڕێزیان(!) ناچاربوون دویان بکەون و چاولێکەری و لایەنگیریان بکەن. هەروەها بەهۆی ئەوەی ئایینەکەیان، گەمارۆدراوی ژێر دەستی موغان و روحانیەکان و ئەمانیش بە تەواوی دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا سەپاندبوو، دەیانتوانی بەگوێرەی حەز و بەرژەوەندیەکانی خۆیان ڕاڤە و لێکی بدەنەوە. بە نموونە یەکێك لە کەرەسەکانی دەرامەت و کار و

(١) بەرەهمەنیزم: بەرەهمایی: پێڕەوی ڕێڕەوی بەرەهما. ناوی ئایینێکی دێرینە لە هندوستان/ سێ خوای لەلا پەسەندە: یەکەم: بەرەهما یا بەرەهمە خوای گەورە، بەدیهێنەری زیندەوەران- ، دووەم: ویشنۆ پارێزەر و ڕاگری کائینات-. سێیەم: سیوا یان شیوا (خراپکەر) لەناوبەری زیندەوەران. -وەرگێڕ- سەرچاوە: فرهنگ فارسی عمید

کاسبیان قوربانی بوو -هەروەك لە ئایینی (ڤەدا)ش دا هەبوو، بەڵام (بــوزا) هەڵیوەشاندەوە.

قوربانی‌کردن زۆر زۆر و، گەورەترین ڕێگای بەدەست هێنانی ســەروەت و سامان بوو، پێچەوانەی ئیسلام، قوربانی کردن بۆ خــەڵك نـەبوو، بـەس بـۆ خودا -خواکانی خۆیان- بوو، جێبــەجێ‌کار و سەرپەرشــتکاری ڕێو ڕەسمــی قوربانی و هەڵگر و بردنی قوربانی بۆ بارەگــای خـوای گـەورەیان (!) جگـە (موغ- روحان) نەدەتوانرا کەسێکی تر بێت. لە ئـاییـنی یـەهودیش دا هــەر بەم شێوەیە، لە بەشی حەوتەمی تەورات دا دەبینــین، کـە تەنــها ڕۆڵـەکانی (هارون)-برای موسی ﷺ- واتە حاخامەکانن، کـە دەتوانــن تـەواوی ڕێ و ڕەسمەکان ئەنجام بــدەن. ئەمەیـە کـە بـۆ هــەر کـار و کردەوەیـەك ڕێســا و یاساگەلێکی قورس و گران و ئاڵۆزیان داناوە. بـــۆ نموونـە زیـاتر لـە حـەفتا لاپەڕەی (تەورات) دەستور و ڕێساگەلێکن بۆ چۆنیــەتی تـەکنیك و دروسـت کردنی کوشتارگا و تابوتی قوربانی و سەربڕینی قوربانی. ئەوەندەش گــران و ئاڵۆز، کە بەس خۆیان-حاخامەکان- دەتوانـــن جێبـەجێ‌کار و ئــەنجام دەری بن، ئیتر نەدەتوانن و نەفامیشــیان هەیـە لـەم بـوارەدا هــەنگاو بنێــن. لــە مێهرپەرستیش دا (موغان) یان (کارتن)ەکان، گەورەترین هێزی دەســەڵاتدار بەسەر هۆزە ئاریەکان دا بوون، هــەروەك چـۆن ئـەمڕۆش جادووگـەر بەســەر هۆزە بەدەویەکان-بەربەریــەکان-دا حوکـم دەکـات. بەنموونـە لــە ئـەفریقای خۆرهەڵات، تەنانەت ریش سپی هۆزەکانیش دیــل و ژێردەســتەی گوفتــار و کردار و ڕێنماییەکانی جادوگەرن.

## قوربانی لە ئیسلام و ئایینەکانی تردا

قوربانی لە ئیسلام دا، بە تەواوی ئاشکرا و پێچەوانەی ئایینەکانی تـرە، کە قوربانیکردنیان تیادا هەیە. قورئان کاتێ لـە بـارەی (حـەج)ەوە دەدوێ، دووجار دەریدەبڕێ، کە ئەگەر قوربانی دەکرێ بۆ نان پێدانی هەژار و نەدار و بێنەوایانـە. نـە وەك ئایینـەکانی دی-کـە تیایـاندا خواردنـی گۆشـتی قوربانیەکە حەرامە-، کە قوربانی تـەنیا بـۆ خواکانـە، بێئـەوەی تەنانـەت پارویەك بە مرۆڤە ئاساییەکان بدرێ.

## هوم یان هائوما

گیایـەکی تایبـەتی پـیرۆز بـووە، کـە مێهرپەرستان و زەردەشـتیەکان، شیلەکەیان دەگوشـی و شـەرابێکیان لێ دروسـت دەکـرد بـەناوی (مـەی و مەنگ) -ئەو وشەیەی، کە ئێستاش لە زمانی فارسـیدا هەیـە. بـە نموونـە دەلێن: فلانی مەنگ بووە، یـان مـەنگیان کـردوە، واتـە مەسـت بـوە یـان مەستیان کردوە-. ئەوان باوەڕیـان وابـوو بـە خواردنـی ئـەم گیایـە دەچنـە قولاییە ڕۆحیەکان و ئیلهامی نهێنیە نادیاریەکانیان بۆ دێ. ئەم شەرابە لە ئایینی (ڤیدا)ش دا هەیە و (سۆما)ی پێ دەوترێ، هەر (هۆما)ی مێهرییـە یـان (سـۆما)ی ڤەداییـە، کـە لـە دواییـدا دێتـە مەزهـەبی زەردەشـتەوە. ئاکامیش لە ئایینی مەسیحیدا ناوی شەرابی پـیرۆزکراو(متـبرك) دەگرێتـە خۆ، کە لە ڕێ و ڕەسمی دوعای (میس Messe) کە بەهۆی قەشەوە ئەنجام دەدرێ و باوەڕیان وایە، کـە گیـانی مەسـیح ئامادەیـە و بـە خواردنـەوەی شەرابەکە پیرۆزیان دەکات.

ئەم سوننەتەی (سۆما) یان (هوما)یە کە لە ئایینی (میترائیسم)ەوە بۆ ئایینی ڤەدا و، لەویشەوە بۆ ڕێڕەوی مەسیحیەتی کاسۆلیکی دەڕوات و، دواییش دێتە ئەدەبیاتی ئێمەوە[1] و سونبولی پاکژی و شەونەخونی و عەشق و عیرفان و مەستی و بێخۆیی و ڕزگاربوون لە ماددیات و، ڕۆیشتن بۆ پلە باڵاکان -بۆ ئەو شوێنەی، کە گوایە سۆفیەکان لەگەڵ شەراب خواردنەوەکەیان دا دەڕۆن- و تیایدا ئارام دەگرن.

## ئایینی تازە و روحانیەتی کۆن

کەواتە رەگ و بنەماکانی مێژوی ئایینی (مێهرپەرستی) ئەمانەیە: باوەڕبوون بە جادوگەری و، باوەڕ بوون بە ئەسڵ بوون و گەورەیی و بەڕێزی بوونی (موغان) و باڵادەستی فراوانی ئەوان. موغان کەسانێکی زۆر خراپ و پیس و بێزراو و داڕماو و ماڵ خۆر بوون، کە کەوتنە بەر هێرشی توندی زەردەشتەوە. ئەمەش چارەنووسی سەرەڕێ و واجب کراوی سەرجەم پێغەمبەرانە، کە کاتێ رادەپەڕن، گەورەترین هێز، کە بەرانبەریان سەنگەر دەگرن، روحانی و دەسەڵات دارانی ئایینی پێش خۆیانە؛ هێرشی (قورئان) کە بۆ زانا جولەکە و مەسیحیەکان (ئەحبار و روهبارەکان) دەیکات ((يأكلون أموال الناس بالباطل)). هێرشی مەسیح بۆ فریسەکان (کە روحانیەکانی سەردەمی ئەوە)، هێرشی زەردەشت بۆ کارپانەکان (کە

(١) مەی و مەیخانە و موغ و موغچە، کە سەرجەم ئەدەبیاتی ئێمەی پڕ کردوە، لەوێوە هاتووە و بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە، کە تاکو چەند سەدەی پێشوش مەیخانەکان زەردەشتیەکان بەڕێوەیان بردوە. -نوسەر-

روحانیـەکانی هـاوپێوەند بـــە رژێمـــی مێهرپەرســـتی‌یە) بەڵگـــەی ئـــەم بیروباوەڕانەن.[1]

## بەڵگەیەك بۆ پێویست بوونی ڕا پەڕینی زەردەشت

زەردەشت لە ســالّی (٦٦٠) لـەناکاو ڕادەپـەڕێ و بـە چـەند بەڵگەیـەك چاوەڕوانی سەرکەوتنی ڕاپەڕینەکەی دەکرێ. یەکێکیان ئەمەیە کـە نـیزامی ژیاری و خاوەندارێتی، دەرد و پێداویستی تازە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی دەرێـژێ و بۆ سارێژکردنیشـــی، داوای چـەند چاکـەکارێکی لێ دەکـات. ئـەوەی کـە (کۆنفۆشیۆس، لائوتسۆ، بودا، زەردەشت، حوکەمای حەوتەم و فەیلەسوفانی یۆنان) هەمووی لە یەك سەردەمدان، بەڵگەیە لەسەر ئەمە، کە زەردەشتیش لەو سەردەمەدا وەڵامێك بوە بۆ دەرد و خواستەکانی تازەهاتووی ئـــەودەمی ئێران.

## بەڵگەیەکی تر

ئاریەکان لە ســـەرەتای هاتنیانـەوە بـۆ هینـد و ئـێران، سـەرەڕای وێـك نەچوونی چینەکانی خاك و کەرەسەکانی زەوی و ئاو و هەوا، بـەڵام هـەردوو لا یەك ئاینیان هەبو-بەهۆی هاوڕەگەزیانەوە-، بەرەبەرە کە لەگەڵ مەرجی

---

(١) ئەمە پیشانی ئەدات کە ئاینی تازەکە بۆ چاککردنی بـارودۆخ و چاکسـازی مەزهـەب دێت، خۆی لەخۆیدا لـــە بەرانبـەری نـیزامی دەســەڵات دارا دەوەســتێ ، ئـەو نیزامـەی کـە ئاینەکەی خۆی ئەگەر هەق بوە، ئەم توشی شێواوی کردووە، ئەگەر هـەر لەسـەرەتاوە ڕاسـت نەبوە وەك هۆکارێکی گـەورە دژی گـەل و بەرژەوەندیـەکانی جـەماەر لـە بـەرژەوەندی هـێزە باڵادەست و حوکمڕانەکان بەکاری هێناوە. -نوسەر-

تـازە و نیـازی نـوێدا روبـەڕو دەبونـەوە، پێداویسـتی و خواسـتی تازەیـان پێویست دەبوو. ئاریەکانی هیند لـە ژیـانی خێڵـەکیدا مانـەوە، ئاریـەکانی ئـێرانیش هاتنــە قۆنـاغی پیشــەی کشـتوکاڵیەوە. بــە تێپــەڕبوون و گۆڕانکاریەکانی ژیان، دیدگا و سیستەمی کۆمەڵایەتی و هەست و ئاکـار و نەریتە کۆمەڵایەتیەکانیش، ئیتر لە میترایسم و ئایینـە بەراییـەکانی پێـش زەردەشت -کە لە خێڵەکانی وەحشی ئاریەکان و، رۆژگاری هاوبەشـی بـیر و ژیانی ئێرانی و هیندی مابونەوە- نەیدەتوانی وەڵامگـۆی داوا و نیازەکـانی تازەی ئێرانی بن. هەر دەبوایە ئایینێك بهاتایە بە تێڕوانین و چەمك و دیدگا و مـەرجی تـازەوە، بنـەمای کۆمەڵایـەتی و ئـابوری و ئاکـار و رەوشـتی هەبوایە، کە بۆ چارەسەری بارودۆخ و رەنگدانەوەی داواکانی سـەردەم بێـت. بە نمونە کەسانێك کە لە پێش دا، ئـاژەڵدار بـوون، لـە شـێوازی خێڵـەکیدا ژیانیان بەسەر دەبرد، بە ئاسانی دەیانتوانی قوربانی بۆ خواکانیان بکەن، بێ ئەوەی خۆیان مافی سـودوەرگرتن و بەشـداربونیان لـە گۆشـتی قوربانیەکـە هەبێت. دەبوایــە لـە رێگـەی خـوادا (خواکـانی خۆیـان -وەرگـێڕ-) بیـان سوتاندایە.

بەڵام هەر ئەوان کە بە قۆناغی پیشەی کشتوکاڵی گەیشـتن، واتـە چونـە ژیانی شاری یان لادێنشینیەوە، لە قوربانی کردن دا زیانی خۆیـان دەبینـن. بۆ ئەوانەش، کە ئیتر ئاژەڵدار نین و نایکەن، قوربانی کـردن قـورس و گرانـە لەسەریان. بۆیە ئەو سوننەتەی، کە لە ژیانی ئاژەڵداری سـادەی پێشـویاندا، دەبوایە بەئەنجامیان بگەیاندبایە، لە ژیـانی تازەیـاندا قـورس و زەحمـەت و توانای ئەنجامدانیان نەبوو. ئاوەها سوننەتێکیش نەیدەتوانی ببێتـە بەشـێك لـە سـوننەت گەلـەکانی ژیـانی رۆژانـەیان، لـە پـەیوەندی کـردن لەگـەڵ

خوداکانیان دا، خۆی لە خۆیدا ئەو جۆرە سوننەتە گرانانە بەلاوە دەنرێ و، وردەوردە فەراموش دەکرێ. ئا لێرەدا زەردەشت رادەپەڕێ و ئاینێك رادەگەیەنێ کە بۆ پەیوەندیەکانی لەگەڵ خوادا، نە پێویستی بە سیحر و جادوگەری هەیە، نە بە قوربانی کردن و موغان و پێشەوایان. جادوگەری بە ناڕاست و قوربانیکردن رەت دەکاتەوە و، گەورەترین بەرهەڵستی دژی کارپانەکان(موغان) دەست پێ دەکات. لە هەموان گرنگتریش تەواوی بت و هەیکەلە لە خوا جۆراوجۆرەکان، کە دروست کردنیان یەکێك بوو لە کار و پیشەی مەزهەبی کۆن، دەیانشکێنێ و لە پەرستگاکان دا نایان هێڵێ و فڕێیان دەداتە دەرەوە. -گەرچی روحانیەکان بە تێڕوانینی تازەتر بۆ خواکانیان دوبارە دەیانگێڕنەوە-.

زەردەشت بە ریفۆرم(اصلاح)ی ئاینی بەدەوی، ئاینێك بەبوون دێنێ، کە بە تەواوی بنەمای جوتیاری و کشتوکاڵی هەیە و، ڕەنگ دانەوەی زیندەگی تازەی ئێرانی‌یە. لە ئاینی زەردەشت دا زۆر رێز لە مانگا گیراوە، بە چەشنێك کە یەکێك لە خواکانیان بەناوی (وەهومەن) بە خوای مانگاکان ناسراوە (ناوی خودی زەردەشتیش -زۆرئەستەر- یان -زەرتۆشتەر-، واتە خاوەنی حوشترانی زەردە، ئەمە دەریدەخات، کە ئەوان وابەستە بوون بە ژیانی خێڵەکیەوە). بەڵام بە پێچەوانەی هیندستانەوە، مانگا لە ئێران دا بەس رێزگیراو بوە، نەك پەرستراو و بەپیرۆز زانراو. لە جیاتی مانگا، کاریز و جۆگە و ئاو، پیرۆزی پەیدا دەکات، کە لە پیشەی ئاژەڵداریدا، مانگا وێنەی ئاژەڵ و ژیانی ئابوری و ئاژەڵداری‌یە، لە قۆناغی کشتوکاڵیش دا ئاو هێمای پیشەی ئابوری کشتوکاڵیە، کە بەها و ئەرزشی هەیە. ئەمەیە کە لە

ئایینی زەردەشت دا، ئاو دەبێتە جێنشینی مانگــا و دەپەرســترێ و بــەپیرۆز تەماشا دەکرێ.

گەورەترین خزمەتی زەردەشت -لەروانگەی ئاگایی ئایینــەوە- ئەمەیــە، کە زیاتر لە هەموو ئایینەکانی تــری بێتــەوحیدی، ئــایین و پەرســتش-کــە کۆڵەکەی ئایینەکانە- نزیــك دەخاتــەوە لــە یــەك خــوا ناســین(التوحیــد) و، ریشەکێش کردنی بت پەرســتی و، بــەکارهێنانی ژیــری بەشــێوە بەکاربــەرە سروشتیەکەی خۆی.

## خوای زەردەشت تاقانەیە یان دوانەیە

لەبارەی (یەك خوا بوون)ی، یان (دوو خوا بوون)ی خوای زەردەشــت، دوو بۆچون هەیە: یەکێکیان ئەو ڕوانگە کلاسیکیەیە، کە زەردەشتیە ئاساییەکان (نەك ئەوانەی، کە ئاراستەکاری باسەکەن) بڕوایان پێی هەیــە لــە دیدگــای ئەمانــەوە، ئــایینی زەردەشــت، ئــایینی دوخــوا پەرســتیە، ڕێــڕەوی خــوای (ئاهورا) و خواکەی تریش (ئەهریمەن).

ئایینی (انگرمئی نو) و (سپنتامئی نــو) و دو زاتــی (خــێر) و (شــەڕ)، هەرکەسێ -هەرچی- ناپاك و خراپ و بەدە، (انگرمئی نو)ە، ئەگەر چاکە و پاکە و باشــە ئــەوە (سپنتامئی نــو)ە. ئــەم دوو زاتــە -(انگرمئــی نــو) و (سپنتامئی نو)- بەردەوام لە بەرانبــەرکێ و بەرهەڵســتی یــەکتر دان، بۆیــە ڕێڕەوی زەردەشت باوەڕی بە دو زات هەیە لە جیهاندا.

روانگەی دووەم: هی ئەو مێژوو نووس و نوســەرە تازانەیــە، کــە کاریــان ڕازاندنەوە و زیندوکردنەوەی ئایینی زەردەشتە، ئەوانەی کە دەبینن مێشك و هۆشی ئەمڕۆی مرۆی جیهان، یەکتایی بوونی خــوا دەناســێ و دانــی پیــادا

دەنێ و ڕێزی لیٚ دەگرێ و دەشی پەرستێ. تەنانەت بێ مەزهەبیەکانیش بە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئایینەکانی تردا، دانی پیادا دەنێن، کە (تەوحید بەرزترین بینای تەواو و بێکەم و کوڕی ئاگایی ئایینییە) -کە ئەمەش ئاشکرا و گومانی تیادا نییە-. بەڵام ئەمان کە خەریکن بە لێکۆڵینەوە و سەرنج دانی ئایینەکان، هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشن، کە لەو ئایینانە سیما و روخسارێکی تەوحیدی بسازێنن. لەو جۆرە کەسانەش بۆ نمونە: (رادهاکریشنان) -نوسەری قووڵ و بەرین، کە لە سۆنگەی ژیربێژی(لوجیکی) ئایینیەوە، یەکێکە لە جێشانازانی جیهانی ئەمڕۆ- دەیەوێت لە ئایینی هیندۆس -سەرەڕای چەند خوا بوونیان- سیمایەکی تاقە خودایی بنەخشێنێ. کە هەوڵ و کۆششی ئەو، شایانی ڕێز و پێزانینە، بەڵام نەك وەك پیشاندان و جوان شیکردنەوەی ئایینی شیرك و بەتەوحید ناساندنی.

ئەگەر ئەو بە تەنیا وەك ئایینێکی نوێ بیروڕاکانی دەخستە ڕوو، زۆر سوپاسمان دەکرد، نەوەك بەم شێوەیە، پێچەوانەی سەرجەم ڕاستی و بەڵگە و هەقیقەتەکان و ئەرشیفەکانی بەردەست بۆ باسکردن و نیشاندانی ئایینی دابنیشێ، گەرچی ڕۆشنبیر هەر جۆر بیەوێت و مەبەستی بێت دەتوانێت باسەکە ئاراستە بکات و بوروژێنێت. کۆچ کردو (دکتۆر موعین)یش، کە پیاوێکی زۆر باش و مەزن بوو[1] -دەترسا لەوەی، کە زانایان و چاکەکان

(١) من هەمیشە لە مرۆڤە زانا و گەورەکان دەترسم، چونکە کاتێك هەڵە دەکەن گوتاوەڕۆی زۆر خراپی لیٚ دەکەوێتەوە و، کاریگەری زۆر ناپەسەند لەسەر هۆش و هەستەکان بەجێ دەهێڵێت. ئیتر ناتوانرێ بەرهەڵستی لەگەڵدا بکرێ، چونکە لە پشت پەردەی ئەم بیرە لاڕێیە، سیمایەکی پیرۆز خۆی حەشارداوە، کە ئەویش سیمایەکی باوەڕپێکراوی گشتی و مرۆڤێکی

هەڵبکەن و وتەیەك بە نارەوا و ناهەق بڵێن و بنوسن-. بەداخەوە ئەم، خۆشی کەوتە ژێر کاریگەری ئەو بیروبۆچونانەوە، کە ئایینی زەردەشتی بە یەکتاناسینی خوا پیشان دا، لەکاتێك دا ئایینی زەردەشتی، شێرکی تەواوە -هاوشێوەی ئایینی (ڤەدا) و (میترایسم)، کە ئەویش (ئاهومەزدا) و (ئەهریمەن)ە و ناکۆکی و جەنگی نێوانیان لە جیهان دا تا کۆتاییە. هەروەها لە دیدگای ئایینی زەردەشتیەوە، هەزاران فریشتە و یەزدان و ئەمشاسپەند و کاریان لە جیهان دا بەردەوام لە ناکۆکی و شەڕ و بەرانبەرکێی یەکتردان. دوبەرەکی و ناتەبایی هەمیشەیی نێوان هەردوو هێزی ئاهورایی و ئەهریمەنی. لە سەرەتای (ئاوێستا)دا چەندین شیعر و سرود هەیە، بەناوی (گاسە) یان (گاتەکان) بە واتای (موقام)، کە ئاهەنگ، یان ئاواز و راز و نیاز دەگرێتەوە -کە زمانناسانی وەك (دارمستتەر) پێی وایە ئەم بەشەی (ئاوێستا)، زیاتر لە هەموو بەشەکانی تر نزیکترە لە زمانی زەردەشت خۆیەوە- هەر بەو زمانەی، کە پەڕاوەکانی (ڤەدای)یان پێ نوسیوە، نوسراوە. بۆیە دەتوانرێ بگوترێ، لە دوو هەزار و سێصەد، دو هەزار و چوارسەد تا پێنج سەد ساڵ لەمەو پێشە. هەندێك بڕوایان وایە، کە لەوە دەچێ ئەم سرودانە، دوعا و پاڕانەوەکان (راز و نیاز)ی زەردەشت خۆی بێت، بەرانبەر بە پەروەردگاری.

بە هەرحاڵ هی زەردەشت بێت، یان دوای زەردەشت بە بوون هاتبێ، زۆر نزیکە لە چەرخی زەردەشتەوە و، بەڵگەترین پەرتوکە، کە لەسەر زەردەشتی

---

پاك و زاهید و چاکە. ئاوا بیرێکی چەوت و کتێبێکی خراپ دەخاتە ڕو، ئاکام زۆر جیلی سەردەمی خۆی و دوای خۆی گیرۆدە دەکات و هەر کەسێکیش بچێتە سەر ئاوەها بیرو پەڕاوگەلێك نەیتوانیوە بچوکترین کاریگەری و بەرهەمی بەسود بەجێ بهێڵێت.

سەرەتا هەمانبێ، کە دەتوانین تا رادەیەکی باش پشتی پێ ببەستین. لە ئایەتەکانی کۆتایی گاتەکان (سرودەکانی زەردەشت)، زەردەشت بە پەروەردگاری دەڵێت: ((ئەی ئاهورامەزدا، تۆ تاریکیت دروست کرد، هەروەك روناکیش))، لەم رستەوە دەردەکەوێ، کە لە بیرو ئەندێشەی زەردەشتی سەرەتا، واتە (مەزداپەرستی)دا، ئاهورامەزدا بەدیهێنەری چاکە و خراپەیە، روناکی و تاریکی‌یە، ناشیرینی و جوانی‌یە و هەموو شتێك، ئاهورامەزدا بەدیهێناوە.

زەردەشت کە هات لەگەڵ خواکانی (موغ پەرستان- رۆحانی پەرستەکان) و خواکانی هیندی -کە هەردوو ئایینی ئێرانی و هیندی تیایدا هاوبەش بوون- گیرۆدە و کەوتە ناکۆکیەوە. هیندیەکان و روحانی پەرستەکان (کارپانەکان) (دەیاس)، یان (دیۆ)، یان (دێو)یان بە خواکانی جیهان دەزانی و، فریشتەکانی نزیك لەمانیش هەر بە هەمان شێوە. هەروەها هەمەچەشنە خودا باشەکانیشیان هەر بە خواکانی جیهان دادەنا. زەردەشت سەرجەم ئەمانەی بە شەیتانە گڵاوەکان ناوزەد کرد.

لە ئایینی (مێهرپەرستی) و لە ئایینی (ڤەدا)ش دا، (ڤارونا) خوای گەورە بوو، (ئاشورا) یان (ئاهورا)، خوای شەڕ و خیانەت و تاریکی. زەردەشت (ڤارونا)ی بە خوای هەوا و ئارەزو و شەڕارەت ناوبرد، -بۆ ئەوەی نێوانی هیند و ئێرانی جوێ بکاتەوە، گیانی ئێرانی سەربەخۆیی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و رەوانی بەدەست هێنابوو، دەبوایە ئایینێکی سەربەخۆشی دەست خستایە-. (ئاشورا) یان (ئاهورا)ی، وەك گەورەترین نازناو بۆ (مەزدا) -کە یەکێکە لە خواکانی هیند و ئەوروپی و ئێرانی- دانا.

(ئاهورا مەزدا)، (مەزدا) بە واتای ئەندێشە و ژیری، (ئاهورا) بە واتای (ربّ) پەروەردگار و خاوەن، (ئاهورامەزدا) واتە: خاوەنی هۆش و ژیری پاك و گەورە، واتە (حکیم). بە گەورەتری لە (مێهر) و (میترا)ی دانا و، لە سەرجەم خواکانی تر بە گەورەتریی زانی و بە پەروەردگاری سەرجەم گەردوون و خوای خێر و خۆشی ناوبرد.

## ئاهورامەزدا و وەدیهێنانی جیهان

زەردەشت (ئاهورامەزدا)ی بەخوای ئەزەلی و ئەبەدی، هۆشمەند و چاودێر و بە توانا و زانا دەزانی. کاتێ ویستی جیهان دروست بکات، سەرەتا گیانێکی رەهای دروست کرد بە ناوی (وەهومەن) -واتە بە ئاگا و گەورە و بەرز و بیر و هۆش، بیر و ئەندێشەی باش-، دوایش (وەهومەن) سەرجەم دیاردەکانی جیهانی دروست کرد.

## وەدیهێنانی جیهان لە ئاییینی زەردەشت و فەلسەفەی ئیسلامیدا

لە فەلسەفەی ئیسلامیش دا وەها باوەڕێك هەیە، کە لەبەر ئەوەی خوا ئەزەلی و واجب و زاتی رەها و بالآیە و لە جنسی جیهان نییە و دێرینە، ناکرێ (حادث)[1] بەدی بێنێ. ئەو کاتە فەلسەفە ئەم کێشەیەی سەبارەت بە خوا دەیخاتە روو(!) -واتە فەلسەفە خۆی دروستی کردوە- هەر خۆیشی وەڵامی دەداتەوە و چارەسەری دەکات. چونکە خوا دێرینە و هەر بووە راستەوخۆ -بەبۆچوونی فەلسەفە- ناتوانێ (حادث) بەدیێ بێنێ. ئەوکاتە

---

(١) حادث: واتە تازەبونەوە، سەرلەنوێ دروست بوونەوە، تازە بەدیهاتوو. -وەرگێڕ-

(حادث) لـە کۆنـەوە سـەرهەڵدەدات، واتـە ئەگـەر لـە کۆنـەوە (حــادث) سەرهەڵبدات، وەك ئەوە وایە کە ئەم (حادث)ە لە خودی دێریــن دا هاتۆتــە دەر. مادام (خوا)ش کۆنە و هەر بوە، واتە رەهــا و تەنهایــە، هــەر ئــەویش (حادث) دروست دەکات. یەکەم جار گیاندارێك دەخولقێنێ بــەناوی لاشــەی یەکەم، یان یەکەمین -کە لەلایەکەوە لەگەڵ زاتی کۆن دا پەیوەندی هەیــە و لەلایەکی ترەوە لەگەڵ زاتی (حادث) کــە ئێمــەین- هــەر ئــەوە کــە لەســەر بنەمای وێك چون(تجانس) لەگەڵ مومکین(شــیاو) و (حــادث)-کــە جیــهانی مادی بێت- جیهان دروست دەکات، واتە ژیــری یەکــەم (أول مــا خلــق الله) هەر ئەم ژیرەیە.

ئەمە گرفتێکە، کە زەردەشت و فەلسەفەی ئیســلامی ســەبارەت بــەخوا دروستی دەکەن[1] و هەر خۆشیان چارەسەری دەکەن. بەڵام خوای ئیسلام ئەم کێشانەی نی‌یە، نوێبونەوە(حادث) لە هەمان زاتی دێرینی‌دا سەر هەڵدەدات و هیچ بەربەستێکیشی نایەتە پێش. (تۆ ئەگەر تێناگەی تێ مەگە!! لەبــەر ئەوەی تێناگەی! شیرك بەو چەشــنە دەرنایــەت، شــیرك هــەر ئەمەیــە، کــە ئێستا تیایدا دەژین!).

---

(١) کەواتە ئەگەر (وەهومەن) لە رێڕەوی زەردەشت دا (ئادەم) بێت و لاشەکەش لــە رێــڕەوی ئیسلامیدا کە (ئادەم)ە، ئەمان هــەردووکیان، واتــە (وەهومــەن و لاشــەکە، خــودا دروســتی کردون و ئەمانیش دەبنە سەرچاوەی دروست کراوەکانی تر. ئەگەر بەم شێوەیە بێ فەلســـەفەی دروست بوون لە رێڕەوی زەردەشت و ئیسلامیدا جیاوازیــان نی‌یــە و بۆشــان دەردەکــەوێ کــە (حادث) لە زاتی دێرینی خــواوە ســەرهەڵدەدات. چونکــە خــوا ئــەوانی بەدیــهێناوە، کەواتــە دروستکراوە تازەکانیش هەر زاتی دروست بوونی خوایان تیایە. -وەرگێڕ-

## (انگرمئی نو) و (سپنتامئی نو)

لـە بیروبـاوەڕی زەردەشـت دا، دو نـــیزامی یـەزدانی بـەناوی زاتـــی خراپ(شەڕ) (انگرمئی نو) و، زاتی خێر (چاك) (سپنتامئی نو) لە جیـهاندا بوونیان هەیە. (ئەنگرە) شەڕە و (سپێنتا) خێری پیرۆز و چاك و، (مئی نـو) بە واتای (سرێشت- فیترەت). (مانتالیتە) ئەمانە گشتیان وشـەیەکن و بـە واتای بیر و ئەندێشـە و هـۆش و دانست(حیکمـەت)، کـە (انگرمنـش) و (سپنتامنش) (زاتی خراپ و زاتی چاك) بەردەوام لە شـەڕ و بەرهەڵسـتی و کێبەرکێی یەکتردان و، هەر یەکەشیان لایەنگر و دەسـتیاری فریشـتەگەلی تایبەت بەخۆیان هەیە.[1]

## یاوەرانی (سپنتامئی نو)

شـەش فریشـتە، یـاخود یـەزدانی نزیـك، یـاوەرانی زاتـی چاکـە (ئاهورامەزدای جیهانن)، کە لەگەڵ (سپنتامئی نـو) جیـهانی خـێر بـەڕێوە دەبەن و، بەرانبەر(انگرمئی نو) و شوێن کەوتوانیان دەجـەنگن. ئـەم شـەش

(١) لە ئیسلامدا لایەنگرانی خێر (فریشتە جۆراوجۆرەکانە)، بەڵام لایەنگرانی شەڕ (جنۆکـە و شەیتانەکانن). خالقی هەمووشیان هەر یەك (زات)ە. -عزیز ئالانی-
تێبینی: لە ئیسلام لایەنی شەڕ و خراپە شەیتانەکانە، کە لـە بنەچـەدا لـە جنۆکـەن، هـەروا جنۆکە سیفەت شەیتانەکانن.. دیارە جنۆکە هەمووی و لە ئەسڵدا لایەنی خراپە و شـەڕ نـین، بەڵکو ئەوانیش وەك ئادەمیزاد چاك و خراپیان هەیـە، مسـوڵمان و بێبڕوایـان هەیـە. خـوای گەورەش لەسەر زمانی ئەوان لە قورئان دەفەرموێ: ((وأنّا منا الصـالحون ومنـا دون ذلـك ... لەناومەشدا کارچاك هەن و تێشـماندا هەیـە وا نیـە))، هـەروا ((وأنّـا منـها المسـلمون ومنّـا القاسطون... وا هێندێکمان موسڵمانین، هێندێکیشمان لـەڕێلادەر))سـورەتی الجـن: ١١ و١٤

ئەمشاسپەندە (گیانی هەمیشەیی و ئەزەلی و ئەبەدین)، بریتین لەمانەی خوارەوە (کە مانگە فارسیەکانیشن):

١-(بەهمەن): (بەه) بە واتای باش و خێر، (مەن) بە واتای مەنێش واتە فیترەت، یاخود فریشتەیەك بەسەرچاوەی خێر.

٢-(ئۆردیبەهەشت) -مانگی دووەمی بەهار-: فریشتەی راستی و دادپەروەری.

٣-(شەهریوەر): فریشتەی هێز یان -بە گوتەی خۆیان- یەزدانی دەسەڵات و توانین.

٤-(خورداد یان خورتات): بەشداری و کامیابی و سەرکەوتن و عافیەت.

٥-(ئیسپەندارمەز): (سپەند) بە واتای پاك و پیرۆز، هەروەك چۆن سیفەتێك لە سیفەتەکانی زەردەشت (سپەندمەن)ە، واتە هەبووی نیهاد یان فیترەتی سپەند(پیرۆز)ە.

(ئیسپەندارمەز) هەر (ئیسفەند)ە و، بە واتای یەزدانی پیت و بەرەکەت و ئەڤین و خۆشەویستی‌یە.

٦-(مورداد یان ئەمرتات): یەزدانی نەمر و جاویدانی.

ئەم شەش (ئیمشاسپەندە) لەژێر رابەرایەتی (سپنتامئی نو) گرۆیەکی حەوت زاتی پێك دێنن، کە جێبەجێکاری ئیرادە و ویست و ئارەزوی (ئاهومەزدا)ن لە روبەڕوبونەوەیان لەگەڵ شەڕ و یارمەتی دانی ئەو مرۆڤانەی کە لە رێڕەوی (ئاهورامەزدا)دا، رێدەبڕن.

لە بەرانبەر ئەمانەدا، شەش فریشتەی شەڕ -یان ئەگەر بشێ بڵێین فریشتەی سزا- شوێن کەوتەی (انگرمئی نو)ن و پێکەوە دەستەیەکی حەوت زاتی، گیانی پیس(خبیث) پێك دێنن. (سپنتامئی نو) و (انگرمئی نو) و

شوێنکەوتوانیان لە هەر دو لای جیهانەوە لە بەرانبەر یەکدا ریزی خێر و شەڕیان بەستوە و مرۆڤیش لەم نێوانەدا ئازاد و سەربەستە، کە کامیانی بوێت پەیوەندی پێوە بکات. ئەڵبەتە بێجگە لەمانە، فریشتەی تریش هەن (بۆ نموونە سروش بە واتای گوێڕایەڵ، وەکو جوبرەئیل، کە لە ئایینی ئێمەدا هەیە).

ئەم دەستە و گرۆیانە سیستەمی متافیزیکی ئایینی زەردەشتن، کە جیهان بینی زەردەشت خۆیشی پیشان دەدات.

لێرەدا دەمەوێ بڵێم: ئەگەر (انگرمئی نو)-خوای شەڕ- و شوێنکەوتوانیشی لەلایەن (ئاهورامەزدا)وە بەدیهێنرابن، ئەم نیزامەی بیروباوەڕە، تەواو لە شێوەی نیزامی ئیمانی ئێمەیە لە یەکخواناسینی ئیسلامیماندا. چونکە لە تەوحیدی ئیسلامیدا شەیتان لەلایەن پەروەردگارەوە بەدیهێنراوە. جا لەبەر ئەوەی کە تەوحیدیش رەها و بێ سنورە، شەڕیش دەبێ دروست کراوی خوای گەورە خۆی بێت، بەڵام ئەگەر (انگرمئی نو) خوای شەڕ (ئاهورامەزدا) خوای خێر بێ هەردوکیان بەرانبەر یەك و یەکسان بن پێکەوە، ئەو کات دەبنە دو خوای زاتی ئەزەلی و ئەمەش شیرك و دو خوا پەرستیە نەك تەوحید. بەڵام هیچکام لە ئەمانەش نی‌یە، نە باوەری زەردەشتە ئاسایی‌یەکان -کە باوەڕیان بە دو خوای بەدیهێنەر هەیە- نە باوەڕی رۆشنبیرانی ئەمڕۆش -کە لەسەر بنەمای تێڕوانینی ئیسلامی دەیانەوێ سیمایەکی تەوحیدی لێ بنەخشێنن- هیچ کام لەمانە نی‌یە. لەبەر ئەوەی تەوحید فیکرەیەکی دیاریکراو نی‌یە لە هۆش و هەستی مرۆڤدا، کە بە یەکجار لە شیرکەوە (شیرکێك لە قۆناغی فیتشیسم و ئەنیمیسم) بۆ بالاترین شێوەی تەوحیدی جیهانی بپەڕێ، بەڵکو تەوحید جۆرێك لە ئاگایی

و تێڕوانینی مەعنەوی و جیــهانبینی زۆر بــەرز و قــوڵ و ناسـکە، کـە بـە قوڵایی و بەرینی گیان و هۆش و فەرهەنگ و هەستە ئایینیەکانی مـرۆڤ دا ڕۆچـوە و، بـە درێژایـی مێـژوی گۆڕانـی ژیارەکـان لـە هەسـت و هۆشـی مرۆڤەکاندا شێوە و باری خـۆی وەردەگـرێ و بـە بـوون دێ. تێگەیشـتن لـە یەکخواناسی(توحید) بەو واتا گرنگ و بەرز و متافیزیکیەی، کە هەیەتی - کە لە ئیسلام و قورئان دا بۆمان رون کراوەتەوە و بۆ زۆربەشمان کـە پـێڕەوان و باوەڕدارانی قورئانین و بێ هیچ گومـان و دودڵیـەك بڕوامـان بـە تـەوحید هەیە-. سانا و ئاسان نی‌یە لە مێشك و هۆشماندا جێی نابێتەوە، کە ئەگـەر مێشکمان دوکەرت بکەن و هۆشمان بۆ دەربخەن زۆر پەڵەی شیرك لە دامێنـی باوەڕمان بەرانبەر تەوحید ئەدۆزرێتەوە. تـەوحید لەگـەڵ (خـودا)دا یەکـە و دوان نی‌یە، ئەگەر دوان بێ واتای نابـێ. تـەوحید هـەروا سـادە نی‌یـە، کـە ئەگـەر سـانا و سـاکار دەبـو، کڕنـوش بـۆ دەوڵەمـەند و ترسـان لـە هـەر هۆکارێکی مەترسیدار، نەدەبوو بچوکترین ڕوشان و زام لە تـەوحید بکـات. بەڵام وانی‌یە کە هەمانە: ((من تعظم بغني ذهب ثلث دينـه)) (هەرکەسـێك بە دەوڵەمەندێك فیز بکات، یەك لەسەر سێی دینی لەدەست داوە) یان (لـە هەر هۆیەکی ترسناك بترسـی ئیـتر یـەك خوانـاس نیـت)، کەواتـە تـرس و کڕنوشی بەرژەوەندی‌یانە چ پەیوەندیەکی بە تەوحیدەوە دەبو، ئەگـەر واتـای تەوحید بە سادەیی هەر ئەمە دەبوو کە (خوا یەکێکە و نابێ بە دوان)؟

شێخ جەعفەر شوشتەری-زانـای رۆشـنبیر و گـەورەوار- بـە لـەهجێکی گاڵتەجاری‌یەوە، یەکتاناسینی درۆینەمان بە مەسـخەرە دەبینـێ. ئـەو لـەم بارەیەوە دەڵێ: ((سەرجەم پێغەمبەران و زانایان هاتن بۆ وەی پێمـان بڵێـن: خەڵکینە! پارە، ستەم، هـێز و دەسـەڵات، قـەوم، خۆیـش(خێـش)، خـاك،

کەسەکان و بتەکان مەپەرستن، خودا بپەرستن. بەلاّم مـن دەڵێم: لەنێوانی پەرستشی ئەم هەموو شتانەدا جێگەیەك بۆ پەرستنی خوداش بکەنەوە، ئەم هەموو شتە دەپەرستن، دەی کەوایە خواش بپەرستن)).

تێگەیشتن لە تەوحید -تەنانەت لە سۆنگەی فەلسەفە و، لە بواری هەست و ئاکاریشەوە- تەواوکاریەکی گیانی بەرزی مرۆڤانەی پێویستە. بێگومان ئەمەش نەیتوانیوە بە چەشنێکی زوڵاڵ و ڕەها و بالاّ، لە ئایینی زەردەشت دا ڕەنگی دابێتەوە.

زەردەشت، رونی ناکاتەوە کە ئایا (انگرمئی نو) هەروەك (ئاهورامەزدا) ئەزەلی و ئەبەدی و کۆنە، یان بەدیهێنراوی (ئاهورامەزدا)یە. ئەگەر بۆمانی رون دەکردەوە، ئەوکات دەردەکەوت، کە هاوبەش دانەرە، یان بە یەکزانی خوایە و بەس.

لەو بەڵگانەی کە ئێستا لەبەر دەستماندایە، ئەمە رون نییە و هەروا بۆ ئێمەش بە نادیاری دەمێنێتەوە، کە ئایا (انگرمئی نو) زاتێکە راستەوخۆ لە بەرانبەر (ئاهورامەزدا)دایە، یان نا، کە ئەگەر لە بەرانبەر (ئاهورامەزدا)دا بێ، ئەوە شیرکێکی هەقیقی و تەواوە. من ئەمە بە زنجیرەیەکی ون دەزانم، زەردەشتیش لە ئاستانەی شیرکەوە بۆ تەوحید و نزیك ترین ئایینی بێتەوحیدی بۆ تەوحید دەناسم -لەسەر بنەمای ئەم بەڵگانەی هەن-. هەر بۆیە لە ئایینی زەردەشتی سەرەتادا، گەورەترین دەسەلاّت و بەرزی هی (ئاهورامەزدا)یە، کە تەنها و بێهاوتایە و هیچ هێز و توانا و دەسەلاّتێك هاوشانی دەسەلاّتی ئەو نییە. لە پلەیەکی خوارتر لە

(ئاهورامەزدا) هێزی (سپنتامئی نو) و (انگرمئی نو) خوای خێر و شەڕن. سێیەمین پلە و دەسەڵاتیش هی شەش فریشتەکەن، کە هاوکارانی (سپنتامئی نو)ن و شەش شوێنکەوتەی تر، کە شوێن کەوتەی (انگرمئی نو)ن. هەر بۆیە لە جیهاندا دوو هێز و دەسەڵات روبەڕوی یەکتر وەستاون و شەڕ دەکەن. هەروەك لە (گاتەکان- سرودەکانی زەردەشت)دا دەردەکەوێ، کە ئەم دوو هێزەن روبەڕوی یەکترن و (ئاهورامەزدا گەورەترە لەم دوو دەسەڵاتە)، نەك ئەوەی کە موبەدەکان دەڵێن: دەسەڵاتی (ئاهورامەزدا) و (ئەهریمەن). لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئایینی زەردەشت، تەوحیدی سازگار و زوڵاڵ و بێ چڵك و پەڵە نیەیە، چونکە گاتەکان و سەرجەم بەشەکانی تری ئاڤێستا، تەواو پشتی پێ نابەسترێ و جێی باوەڕ نییە. چونکە لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمی لەدایکبوونی (مەسیح) -سەردەمی ساسانیەکان-دا دروست کراوە. پشت بەستن و باوەڕبوون بە ئەمانە دروست وەك ئەوە وایە، کە بەوەی لە دوو سێ سەد ساڵی ئەخیر بە بوون هاتوە. گەر بنەما ئیمانیەکانی سەردەمی پێغەمبەر دیمەنکێش بکەین، بۆ تێگەیشتن لە بنەماکانی باوەڕی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێ بچینەوە سەر قورئان و[1] (نهج البلاغە)[2] نەك بەرهەمی دوو سەد تاکو سێ سەد ساڵی ئەخیر.

بەڵام ئەمەی کە تەوحید و شیرکی زەردەشت لە (گاتەکان)دا رون نییە، تەنیا بەهۆی دیارنەبوونی بەڵگە و ئەسنادەکان نیە، بەڵکو لە راپەڕینی

---

(١) فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ. -وەرگێڕ-

(٢) وتەکانی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب.

تێبینی: لە ئیسلامدا سەرچاوەی وەرگرتن بریتیە لە قورئان و سوننەت، نەك شتی تر. -نووسەر-

سەرەتای زەردەشتیش دا ئەمە ڕون نەبوە. پێچەوانـەی ئـایینی ئیـبراهیمی، کە ئاشکرایی و دیاربوون و هەستیارێتی تەوحید تیایدا هـەر لـە سـەرەتاوە ڕۆشن و ئاشکرایە، کەچی لەدواییدا لیێ تێنەگەیشـتن، یـان خـراپ کاریـان پێکرد. ئەم هەڵەیە هی ئایینی ئیبراهیم خۆی نەبوو، بەڵکە هی کەسـەکانی تر بو، کە پۆشاکی شیرکیان لەبەر تـەوحید کـرد، چونکـە کاکڵـە و کرۆکـی تەوحیدی ئیبراهیمی تەواو ڕون و زوڵاڵە و شیرك نیە.

لە ئایینی ئیسلامیشدا بە چەشنی ئـایینی زەردەشـت، شـەیتان هەیـە، بەڵام نەوەك لە بەرانبەر خوادا، بەڵکو لە بەرانبـەر مـرۆڤ دا. مرۆڤـەکان و شەیتانن، کە پێکەوە لە شەڕدان، نـەك شـەیتان و خـودا. خـێر و شـەڕ لـە ئیسلامدا هەیە (لەجیهانی بەدیهاتودا)، بەڵام تـەنیا و تەنـها لـە جیـهانی ژیانی مرۆڤایەتیدا. بەس لە شوێنێکدا کە مـرۆڤ هەیـە، خـێر و شـەڕیش هەیە، بەڵام جیهان سەرتاپای خێری ڕەهایە و یەك زات و یەك ڕێگـا و یـەك ڕێڕەوی هەیە، هەروەها یەك ئیمپراتۆر و کردگار و یەك دەسـەڵات و هـێز و یەك ژێربێژە، کە حوکم دەکات.

## ئاییینی زەردەشت ڕێڕەوی دوو خوا پەرستی

ئـایینی زەردەشـت، جـا چ شـێوە تەوحیدیەکـەی بگریـن -واتـە بڵێـین (انگرمئی نو) لەلایەن (ئاهورامەزدا)وە بەدیهێنراوە-، چ شـێوە شـیرکەکەی واتە دوو (ئالیسم) و دو خودایەکەی بگرین -واتە بڵێین (انگرمئی نـو) لـەو ساتەوە هەبوە، کە (ئاهورامەزدا)ش هەبوە-، لە هەردو شـێوەکەدا ئـایینی دو خوایی‌یە، -تەنانەت لە تێگەیشتنی زەردەشت خۆیشی بـۆ تـەوحید دا-. چونکە سەرجەم گەردون لە دو زات و دو ڕەگەزەوە دەبینێ -خـێر و شـەڕ و

تــاریکی و رونــاکی-، کــە هــەرچی خــراپ و پیــس و شــەڕە لــە دەســـتەی (انگرمئی نو) و، هەرچی چاك و جوان و خێرە، لە ریــزی (ســپنتامئی نــو). هەر بۆیە جیهانبینی ئایینی زەردەشت، لەسەر بوونی جەنگی جیهانی نێـوان دوو هێزی باڵای مرۆڤایەتی، واتە هێزی شەڕ و هێزی خێر دامـــەزراوە. ئــەم جیهانبینی دو دەسەڵاتی‌یە، هەروەك چۆن سروشت و ژیان و هەستی دەکاتــە دو بەش، مرۆڤ و جیهانی مرۆڤیش بەسەر دو دەستەی دژ بە یەك دا بــەش دەکات.

## زەردەشتی موبەدەکان ( روحانیەکان )

تا ئێرە هەرچی باسکرا پێناساندن و ناسینی زەردەشتی سەرەتا بوو. لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم، کە ئەو زەردەشتەی موبەدەکانی زەردەشت (مـــەلاکان) دروستیان کرد و ئەو مەزهەبەی، کە بۆ بەرگری و بـــەرژەوەندی روحانیـــەکان خستیانە گەڕ، وێنا بکەم.بەم چەشنە دەتوانین بـــەراورد و، تــا ئاکــامێك بــە ئاکام بگەین.

## ئایینی زەردەشت، ئایینی ئاو و درەخـــت و سەوزایی

لە سەرتاوە ئایینی زەردەشت لەسەر تایبەتمەنیـــەکانی ژیــانی کشــتوکاڵی دامەزراوە، -هەرکەسێك قەناتێك هەڵبکەنێ بەرەو بەهەشت دەچــێ-. هــەر لەبەر ئەمەشە، کە دەبینین لە نزیك خوراسان (لەگەناباد) سەد تاکو ســـەد و پەنجا مەتر زەویان بە مەبەستی گەیشــتن بــە ئــاو هەڵکــەندوە. ژمارەیــەکی زۆریان،لێبڕاوانە و خزمەتکارانە لەم کارە خێرەدا بەشداریان کردوە، تەنانەت گیانیان لەم پێناوەدا بەخشیوە. بۆ ئەوەی لە قوڵایی بیرەکەوە رێگەی بـــەرەو

بەهەشتی چوون بدۆزنـەوە. جگـە لـە ورە و بـاوەڕی ئـایینی، هیـچ هـێز و توانایەك ناتوانێ مرۆڤ بەو چەشنە بخاتە گـەڕ، تەنانـەت هیـچ بازویـەك - تەنانەت بازوی تەکنیکیش- ناتوانێ هێز و وزەی ئیمانی ئایینی هەبێ.

پیرۆزی ئـاو، پـیرۆزی مانگـا، پـیرۆزی بـیر و کـارێز و جۆگـە و پـرۆزی سەوزایی، سەلمێنەری ئەم راستیەیە، کە ئایینی زەردەشـت -بـە پێچەوانـەی ئایینی (میترائیسم) کە ئایینی قۆناغی ئاژەڵداریی‌یە- کاراکتـەرێکی تـەواو کشتوکاڵی هەیە.

## ئایینی زەردەشت، ئایینی واقع گەرێتی

ئایینی زەردەشت، پێچەوانەی ئایینی (بودا)، کـە جیـهان هـەمووی بـە رەنج دەزانێ، ژیان لە یەك رەگەز و توخم دا دەبینێتەوە، کە ئەویش رەنـج و زەحمەتـە. هـەمو پـەیوەندی و پێداویسـتی‌یەك، بـە مایـەی سەرشـۆڕی و بێبەختی و ناسۆر و داڕمـان و پەرێشـانی دەزانـێ و، جیـهان و سروشـت و مرۆڤ بەدبینانە دەبینێ، ئایینی خۆش بـاوەڕی و واقیـع گەرێتی‌یـە. بـەڵام ئایینی زەردەشـت بـە تونـدی هـانی کـار و بەرهـەم و کشـتوکاڵ دەدا، بـۆ ئەنجامدەرانیشـی پاداشـتی فـراوان دەژمـێرێ، ژیـان و هاوسـەرگیری و یارمەتی‌دانی هاوسێیان بە بەرز ڕادەگرێ، بنـەما رەفتـار و ئاکارەکانیشـی هەر لەسەر بنەمای پەیوەندیەکانی کاری کشتوکاڵی دامەزراوە. پێچەوانـەی ئاکار و کرداری (بوزایی)، کە بناغەکەی نەفی‌کردنی ژیانی ماددی و خەریك بـوون بـە دەرون گەریتی‌یـەوە و توانـەوە تیـایدا و لـە دەرونیشـەوە بـەرەو میتـافیزیکی چـوون دامـەزراوە. بەسـەر گیـانی ئـایینی زەردەشـت دا ریالیزمێکی (واقیع گەرێتی) توند و بەهێز دەسەڵاتدار و باڵادەستە.

# ئایینی زەردەشت، ئایینی فەلسەفەی موجەبی مێژوو

لە بیروباوەڕی زەردەشت دا، گشت مێژو بە سەر سێ قۆناغ و دەوردا دابەش دەبێ. هەر قۆناغێکیش چوار هەزار ساڵە، لە کۆتایی هەر خولێکیشدا مێژو دوبارە دەبێتەوە. (سوشیانت)ێك پەیدا دەبێ، کۆتا (سوشیانت) -رزگارکەری مژدەپێدراوی زەردەشتی- لە کۆتایی هەمان خول دا دێت و، دوای ئەم ئیتر قیامەت دێت و سەرکەوتنی رەهای خێر و رزگاری مرۆڤەکان لە پیسی و خراپە بە ئەنجام دەگەیەنێ. بڕوابوون بە رەجعیەت، لە ئایینی زەردەشتییشدا -هەروەك شیعە و کۆمەڵەکانی تری ئیسلامی- بوونی هەیە. لە باسی (حسین وارث آدم) و (انتظار مذهب اعتراض) پیشانم داوە، کە چاوەڕوانی شیعە بۆ رەجعیەت، بە چ واتایەك دێ. زەردەشت باوەڕی وایە، پێش کۆتایی هاتنی دونیا (سوشیانت-رزگارکەر)ەکان دێن و لەسەر بنەمای هەقیقەت و راستی، مرۆڤ رزگار دەکەن و حکومەتی داد و پاکژی لە جیهاندا بە بوون دێنن. ئایینی ئیبراهیمی لێ دەرچێ، ئایینی زەردەشت یەکەمین ئایینە، کە دواڕۆژ بە شێوەیەکی ئاشکرا و دیار دیمەنکێش دەکات، کە دوای مردنی مرۆڤەکان و جیهان، رستاخێزی[1] گەورە سەر هەڵدەدات، مردوەکان زیندو دەبنەوە و لە بەرانبەر (هەژمار-رۆژی لێپرسینەوە و حساب)دا دەوەستن و تەرازوی دادپەروەری دادەنرێ و کەسێتی (ئاهورامەزدا) خۆی سەرپەرشتی کار و هەڵسەنگێنەری تەرازوەکەیە و گوناهەکان دەکێشێ. ئەوانەی تاوانی قورسیان هەیە بۆ دۆزەخ و ئەوانەشی سوك -یان هیچ- بەرەو بەهەشت دەبرێن.

---

(١) رستاخێز : قیامەت .

(بەهەشت) واتە (بەه)ە واتە شوێنێك کە خۆشە و چاکـە، (دۆزەخ) واتـە جێگایـەك کـە (نـاخۆش و دژ و خـراپ)ە، جێگـەی بـەد و خراپەکارانـــە، جەهەننەمە.

## چینڤات پوهل، شینڤات پُل ( پرد )

پردی (چینڤات)، پردێکە تایبەت بە ئایینی زەردەشت -هەروەها لەسـەر زمانی عەوامی ئێمە و موسڵمانانیش دا هەیە- کـە لـەنێوانی بەهەشـت و دۆزەخ دایە. ئـەو کەسـەی لـە تەرازوەکـە رزگـار دەبـێ، چ رزگـار کـەر -بەهەشتی بێت- و، چ حوکمدراو -جەهەننەمی بێت-، چ غەزەب لێگـیراو و چ خۆش ویستراو، دەبێ بەسەریدا تێپەڕ ببێ. ئا لەوێ دایە، کـە زەردەشـت دێت و بە یارمەتی یەزدان و فریشتەکان (ئەمشاسـپەندەکان)، ئەوانـەی کـە لە زاتی (سپنتامئی نو)ن، دەستیان دەگرێت و بـەرەو بەهەشـت دەیانبـات. ئەوانەشی کە شایانی سزا و دۆزەخن، هەر لەوێدا فڕێیان دەداتـە دۆزەخـەوە -چونکە پردەکە بەسەر دۆزەخ دا راهـەنگێوراوە-، ئەمـە هـەر ئـەو پـردی (سیرات)ەیە، کە لە بیروباوەڕی عەوامی ئێمەش دا هەیە. کـە (صـراط)یـان لە زمانی عەرەبەوە وەرگرتوە ((أهدنا الصراط المستقيم)) واتە: (خوایـە بـۆ رێگەی راست و دروست رێنماییمان بکە)، بەڵام وەك زۆرێك لە چەمکـەکان واتاکەیان شێواندوە. بەم چەشنە: خوایە ئێمە دوای مردن بۆ رێگـەی راسـت رێنمویی بکە، واتە ئێستا دەزانین لە کوێین و بۆ کوێ دەچین، هـەر بۆیـە لـە ئێستادا پێویستمان بە رێنمویی تـۆ نیـە دوای مـردن کـە گەیشـتینە سـەر پردەکە پێویستمان پێت هەیە و فریامان بکەوە و هیدایـەتمان بـدە! بێئاگـا لەوەی، کە دەبێ لێرە رێنمویی و رێگای هیدایـەت بگـرن، تـاکو هیدایـەتی

ئەوێش بەدەست بهێنن و یارمەتی رزگاربونیان بدرێـــت. نـەك ئـەوەی لـێرە هەرچی روی دا، روی دا وازی لیٚ بێنیت و گوێی لە ئاست کەڕ بکەی؛ ئــەو کات لەوێ ڕێنموێنیت بکەن و لە ڕێگا(پردەکــە) رزگـارت بکـەن! بۆچـی و لەبەرچی؟

سەرجەم مەسەلەکانی پێش مردنیان، دەست لێنەدراو بــۆ دوای مـردن و رستاخێز گواستۆتەوە. خۆیان و زۆرێکی تـری وەك خۆیانیــان حەسـاندۆتەوە بەوەی، کە لەو دونیا داوای هیدایەت و دەست گرۆیی بکەن!

## ئایینی زەردەشت، ئایینێکی موجەب بەلام سادە و بێگیان

بەخێرایی هەروەك چۆن لە ئایینی (بودا) و (ڤەدا)دا گوتم، کە هەر کەس کەوتە ژێر کاریگەری و، گەرم و گوڕ بوو، جولا و جۆش و خرۆش و شـەپۆلی بەهێزی ئــایینی پـەیداکرد و لــە قولایـی و سـۆز و قەشـەنگی خـەیالات و هەستەکان دا پڕ و لێوان لێو بوو -سەرەڕای بــەدبین بونـی ئـایینی هینـد-. ئێستاش کە باســی زەردەشـتم بـۆ کـردن، هیـچ شـۆر و شـەوقێك هەست پێنەکرا. وەك بڵێی کە (جەدوەلی زەرب)م گوتبێ! ئەمــە تـاوانی ئایینەکـە خۆیەتی کە گیانی نییە. ئایینێکە بە تەواوی گرێدراو و بناغەدارە بــە ژێـر و بیری لۆجیکی و، ژیانی کۆمەلایەتی سازێنەر و خۆشبەخت و خۆشـبینانە، بەلام لەهەمان کات دا بە تەواوی روکەش و ســادە و ســاکارە. ئەمەیــە کــە دەبینین لە مێژوی کۆن دا، دەســەلات، شـکۆیی، فراوانــی و مــەزنی ژیــار، بوونیان هەیە، بــەلام لــە قولایـی زیرەکـی و زانـایی و جوانـی و ناسـکی و هونــەری قولــی مرۆیـی و رەوشــت و کـرداری نـەرم و نیـان و بـەرز -بــەو چەشنەی، کە لە ئیسلام دا هەیە- بوونیان نیە.

ئەگەر بۆ تەماشاکردنی مۆزەخانەی (لور) بڕۆن، لـە بەشـی تایبـەت بـە ئـێران، شـت گـەلێکی گـەورە دەبینـی -چوارچێـوەی سـەر دەرگاکـان و هەیکەلانێك لە پیاوانی پارسـی و پـارتی و هتـد.-، بـەڵام لـە فەرهـەنگی بەرین و قوڵ -لە شێوەی فەرهەنگی ئیسلامیدا- هەسـتە جـوان و ناسـك و قوڵ و بەرینە عیرفانیەکان -بەو چەشنەی کـە لـە هینـد هەیـە-، دانسـتی فەلسەفی زۆر دشوار و ئاڵۆزی مـەنتقی -ئـەوەندەی، کـە لـەو سـەردەمەدا یۆنان خاوەنی بوو- نیشانەیەکیان لیّ بەدی ناکەیت و بونیان نی‌یە.

## کارەساتی ئایینی زەردەشت

گوتاوەڕۆی کارەساتێك، کە لە ئایینی زەردەشتیەکانەوە بە بـوون هـات، هێنانی (ناچاری= جبر) بـوو بـۆ نـاو ئیسـلام. گـەرچی زەردەشـت مرۆڤـی لەنێوان خێر و شەڕدا بە سەربەست دائەنا، بەڵام بە دابـەش کردنـی جیـهان بەسەر دوو هێزی دژ یەك دا، (ئەنگرە- شەڕ) و (سپێنتا- خـێر)، پـەناگا و پایەی بە شەڕ بەخشی. لە کاتێکدا شەڕ لە ئیسلامدا، لایـەنی جەوهـەری و سەرەکی نیە، بەڵکو لاوەکی(عَرَضي)یە، خوا و سروشـت بونیـان نـەهێناوە. مرۆڤی جەنگ خواز و ئاژاوەگێرە، کە شەڕ و شۆڕی بەبوون هێناوە، دەبێ لە گەردنی بدەیت بۆ ئەوەی تەواو بێت و نەمێنێ. بەڵام لە جیهانبینی دو خـوا پەرستی ئایینی زەردەشتی‌دا، شەڕ (بـە چەشـنی خـێر) بناغـە و کۆڵەکـەی جیهانی هەیە، بەشـێکی سروشـتی گەردونـە. بونـی لۆجیکـی و ئـەزەلی و میتافیزیکیە و، ئیرادە و کاندید و خوای میتـافیزیکی مرۆڤـە خراپەکانـە. ئیتر ئەوەی لەم نێوانەدا دەمێنێتەوە منـم، کـە ئـیرادەی ئـازادیم و دەتـوانم (خێر -سپێنتا) یان (شـەڕ- ئـەنگرە) هـەڵبژێرم، بـەڵام مـن خـۆم -وەکـو

سەرپشکەر- زاتیم بەم واتایەی، کە ئایا لە زاتی (انگرمئی نــو)م، یــان لــە زاتی ((سپنتامئی نو)م. هەر بۆیە منی سەربەست خواز دەتوانم بــە ئــازادی (خێر)، یان (شەڕ) هەڵبژێرم، کــە ئەمــەش لەســەر بناغــەی سروشــت واتــە (فیترەت)م دەبێ، کە ئاهورایی‌یە، یان ئەهریمــەنی، ئــەنگرە یــان ســپێنتایە دەتوانم یەکلای بکەمــەوە. هــەروەك ئــەوەی کــە زەردەشــت دەڵــێ: جیــهان لێواولێوە لە خێر و شەڕ. ئەم دوانەش هەردەم وەکو رونــاکی و تــاریکی لــە حاڵەتی شەڕدان. ئەوانەی لە زاتی ئاهورایی، سپێنتایین بۆ لای چاکە و باشە و پاکە، ئارەزو و مــەیلیان هەیــە، جگــە لــە چاکــە شــتی تــر هــەڵنابژێرن. ئەوانەشــی کــە لــە زاتــی ئــەنگرەیی، ئەهریمــەنین، لــــە چاکــــە بــــێزارن و پێچەوانەکەی هەڵدەبژێرن.

بۆیە منی سەرپشککار دەتوانم هەڵبژێرم و ئــازاد و رەهــام، لەســەر ئــەو بنەما و ئارەزوەی، کە سروشت و ناخم داوای دەکات، ناشــتوانم پێچەوانــەی نیهاد و ویژدانم هەڵبژێرم. ئەمەیە کە بــەو ســاکاری و خێرایی‌یــە، ئــیرادە و سەرپشکی زەردەشتی بۆ ناچاریی(جبر) دەگــۆڕێ، هــەر ئەمەشــە دێتــە نــاو ئیسلامەوە و ئەمەوی‌یەکان درێژەی پێدەدەن و فراوانــی دەکــەن، تــاکو بــەو ئاکامــە بگــەن، کــە بــانگخوازە روحانیــە زەردەشــتیەکان و ساســـانیەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، کە بێبەختی و دامــاوی و بــەش مەینــەتیان لەســەر بنەما و سوننەتی سیستەمی گەردونە، نەك ئاکام و بەرهــەمی بــەرژەوەندی خوازان و، کردەوەی ملهوڕ و دەسەڵاتداران.

هەروەها ئەمانیش-ئەمەویەکان- بە برەوپێدانی جەبر[1] بوو، کە توانیان بە خەڵکی بڵێن: ئەگەر (عەلی) شکستی خوارد و قوتابخانەکەی نابود بـــوو، کە ئێمەش هاتینە ســەر تــەختی فـەرمانڕەوایی، هێنـدەی تریـش دامــاو و بێچارەنوستر بوون، کە لە پێش ئیسلامدا هەبوون، نە تاوانی ئێمەیە و، نــە تاوانی خۆشــتانە، قەزاوقــەدەری ئیلاهی‌یــە، نــەك تــاوان و کەمتەرخــەمی کەسانی تر. تازە ئیتر کار لەکار ترازاوە و کەسیش ناتوانــێ کــارێك بکــات، چونکە دەستی مرۆڤی تیا نیە. بۆ ئەوەی بەم دەنگۆ و فڕوفێڵە دەستی گــەل زنجیر کەن و، لە کرداری خۆیان دوریان بخەنەوە و بیانخەوێنن.

ئەم جەبرە، کارەساتبارە، مژدەدراوی ئـاییـنی زەردەشــتی و پێشــەواکانی بو، بۆ ناو ئیسلام و موسوڵمانان و هەر بەم بەڵگەیەشــە کــە پێغەمبــەرﷺ دەڵــێ: ((القدریــة مجـوس هــذه الأمــة))[2] قەدەریــەکان و جەبریـــەکان ئاگرپەرستانی نەتەوەی منن.

## بەڵگە ژێریەکان لە ناسینی ڕاستێتی زەردەشت

لە ناوەڕۆکی (ئەڤێستا)دا نیشانە و ئایەتگەلێك هەیە، کــە بــە ئاشــکرا (ئاهورامەزدا) بە دروستکەری هــەموو شــتێك و کەســێك، خــراپ و چــاك،

(١) جەبر: واتە کارێك بــەزۆر بەســەر کەســێکدا بســەپێنی. هــەروا نــاوی فیرقەیەکــە، کــە هەوادارانی بە (جبریە) یان (مجبرە) ناسراون. بە بڕوای ئەوان ســەرجەم کردەوەکــانی نــادەمیزاد لەسەر ئیرادە و ویستی خوا بە بوون دێن و، هیچ ئیرادە و سەرپشکیەك بۆ مرۆڤ نیــە. جــەبر واتە دژی ئیختیار و پێ سپاردن. -وەرگێڕ-
سەرچاوە/ فەرهەنگی فارسی عەمید.

(٢) حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَعِيلَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ قَالَ حَدَّثَنِي بِمِنًى عَنْ أَبِيهِ عَـنْ ابْنِ عُمَرَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ مرفوعا.. سنن أبي داود رقم ٤٠٧١

رونـاکی و تـاریکی دەزانـێ، بـەبێ هاوتـای ئـەزەلی و ئەبـەدی دەزانـــێ. (سپنتامئی نو) و (انگرمئی نو)ش بە دروستکراوی (ئاهورامـەزدا) دادەنـێ. ئا لێرەدا زمان و ئەندێشـەی تـەوحید دەبینـم، بـەڵام کـە بەشـەکانی تـر و ناوەڕۆکی ئەو بەشانەی تـری ئاڤێستا دەخوێنمـەوە، بـۆم دەردەکـەوێ کـە (ئاهورامەزدا) دەکەوێتە بەرانبەر (ئەهریمەن) و، هەردوو لاشـیان ئـەزەلی و ئەبەدی، یەکیان خوای رۆشنایی و چاکەیـە، ئەویتریشـیان خـوای تـاریکی و خراپەیـە. لێرەدایـە کـە بۆنـی شـیرك دەدات، کـە ناشـێ لـە پـەڕاوێکدا، فەیلەسوف و بیرمەند و کەسایەتیەکی گەورەی وەك زەردەشت، یەکتاناسیش بێ و هاوبەش دانەریش. دەبێ یەکێك لـەم دوانـە بـێ نـەك هـەردووك. بـۆ دەرخستن و تێگەیشتنی ئەمەش بۆ کۆنترین و یەکـەم بەشـی دەگەڕێینـەوە؛ ئەگـەر لـە نـاوەرۆك و بەشـەکانی کۆنـی پـەڕاوی ئاڤێسـتادا نیشـانەی (تەوحید)مان دەست کەوت، بۆمان رون دەبێتـەوە، کـە ئایەتـە شـیرکەکان، زیـادکراوی دەسـەڵاتداران و زۆردار و سـتەمکارانی کۆمەڵگەیـە. چونکـە تەوحید هەمیشە لە زیـانی ئـەم کۆمەڵـە دوبـەرەکیخواز و تـاقم و حـیزب پەرست و نەژادپەرست و توێژپەرستانەیە. گەر نا، تا کاتێ، کە ئایین زوڵاڵـە و سازگارە و، بەشێوەی راپەڕینێکی هۆشیارانە و رێکخستنی سەرەتادا، لـە هۆش و بیر و هەستی دامەزرێنەری گەورەی شۆڕشەکەدایە، تەوحیدە. بـەڵام لە دواییدا کە دەکەوێتە دەست حکومەت و، کۆمەڵەی رەسمی روحانیەکان و هاوشێوەکانیان، ئیتر شێوەی سوننەت وەردەگرێ و لاری و چـەوتی و لادانـی تیا روودەدات و شیرك تیایدا هەڵئەتۆقێ. ئەمە بەڵگـە ژێریەکانـە، قەرینـە نەقلیەکەی رونترە.

# قەرینە نەقلیەکان لە ناسینی ڕاستێتی زەردەشت دا

پەڕاوی ئاڤێستا، شەش بەشە، ئەگەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی لاپەڕەکانی هەڵدەینەوە، واتە لە سەردەمی کۆنەوە بۆ تازە بێین، یەکەم بەشی (گاتەکان)ە، کە بە بڕوای زمانناسانی گەورەی وەك (بن ڤەنیست) گوتراوەکانی زەردەشت خۆیەتی، کە بەناوی سرودە ئایینییەکان لە بەرانبەر (ئاهورامەزدا)دا گوتونی. زمانناسان، زمانی ئەم سرودانە بە دێرینترین زمان دەزانن، کە لەنێوان ئێمەدا زانراوە و هەیە.

چەندین سرودیان بۆ (گاتەکان) زیادکردوە، کە کۆمەڵەی (گاتەکان) و زیادکراوەکانیش (یەسنا) پێك دێنن، کە کۆمەڵە سرودێکە تایبەت بە دادپەروەری و پەرستنی خوا.

ئەوەی بۆ (گاتەکان) زیادکراوە، زمانێکی تازەیە، کە لە لایەنی زمانناسیەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەخامنشیەکان. ئنجا بە (ویسپرد) و (وەندیداد) دەگەین، کە لە سۆنگەی زمانناسانەوە بۆ کۆتاییەکانی سەردەمی ساسانی -نەك سەرەتای ساسانی تەنانەت سەردەمی ئەشکانی و هەخامنشیەکانیش نا- ، بەڵکو بۆ کۆتایی ڕۆژگاری ساسانیەکان دەگەڕێتەوە.

کەواتە لە ڕوانگەی کاتەوە، ئەڤێستا لە سەردەمی زەردەشت دەست پێدەکات و یەکەم بەشیشی (گاتەکان)ە و، بە کۆتاییەکانی چەرخی ساسانی (سەردەمی ئەنوشیروان) و سەرەتای هاتنی ئیسلام دەگات. ئەمە لەلایەنی ساڵ و بلاوبونەوە و کۆکردنەوە و دروست بوونی پەڕاوەکە، بەلام لەلایەنی تەوحیدەوە:

## گەشتی تەوحید لە ئاڤێستادا

لەکاتی خوێندنەوەی ئاڤێستا، هەرچی لە (گاتەکان) دور دەکەوینەوە، لە تەوحید و ئاوازی (ئاهورامەزدا)ی تاك و بێهاوتا و زەردەشتێك، کە (ئاهورامەزدا)ی بە بەدیهێنەری هەموو شتێك -رۆشنایی و تاریکی، چاکە و خراپە، ناشیرینی و جوانی- بانگ دەکات، دور دەکەوینەوە. کە دەگەینە کۆتایی کتێبەکە، بەشێوەیەکی رون و ئاشکرا، جیهان بۆ دوو نیوە دابەش دەبێ. دو وڵات، دو سنور، دو نەژاد و دو سەرۆك پەیدا دەکات، کە هەردوکیان هاوشان و هاوهێز و وزەن و لە بەرانبەر یەکیشدان. لایەکی (ئاهورامەزدا)یە و بەرانبەرەکەی (ئەهریمەن)ە، واتە خوایەکی تاك و تەنیا، کە دروستکەری شەیتان و یەزدانەکان و خێر و شەڕ بوو، ئەوە خۆی بووە بە دوو بەش (نیوەی خێر و نیوەی شەڕ) و خۆی لە بەرانبەر نیوە شەڕەکەی خۆیدا وەستاوە.

بۆیە ئاڤێستای کۆن کرۆکێکی دینی تەوحیدییە، هەرچیش بەرەو پێشەوە بێین و لە رۆژگاری ساسانیەکان نزیك بینەوە، بە شیرکێك دەگەین، کە کۆڵەکەکەی دوخواپەرستییە و زۆریش ئاشکرا و بێگومان و بێڕاڤە و بێتەفسیرە.

## قورئان حەریمێکی ڕێگەنەدراو

دوژمنانی تەوحید نە تەنیا بەرانبەر (ئەڤێستا)، بەڵکو بەرانبەر پەڕاوەکانی تریش هەر ئەم کارەیان کرد، بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ هەلپەرست و ئاژاوەگێڕان بکەنەوە. بەڵام بۆ حەرەمی قورئان نەیانتوانی بێن و تەوحیدی

ئیسلامی لە قورئان دا بە شیرکەوە بئالێنن. چونکە قورئان لە (٦١٠)ی لە دایك بونی مەسیح نێردراوە، ئەمەش سەدەی ژیارە گەورەکانی ئێران و رۆم و یۆنان و چین و هندستان و میسرە. دەورەی بلاوکراوەی گشتی و شارستانێتی جیهانی‌یە، پارێزەرانی قورئان کەمایەتیەکی سەرلێشێواو و تالانچی نەبوون، بەلکو بەهێزمەندانێك بوون، کە چارەنوسی جیهانیان دەستنیشان دەکرد و دەگۆڕی. بەلام هەرگیز نەیانتوانی، تەنانەت تاکە ئایەتێکی ئەم پەڕاوە لەناو ببەن و بگۆڕن.

قورئان نوێترین پەڕاوی دونیایە، پێغەمبەری ئیسلام، تاقە پێغەمبەرێکە، کە کەسێتیەکی مێژوی تۆمار کراو و بێ‌گومانی هەیە. لە وجودی زەردەشت و موسا و عیسا -تەنانەت- ئەو هەموو گومانە کراوە، بەلام لە بارەی پێغەمبەری ئیسلامەوە کەسێك نەیتوانیوە گومان دروست بکات، چونکە لە رۆژگاری روناکایی مێژودایە، هەر دوای ئەویش پەرتوکەکەی (قورئان) پەروەردە و فێرکردنی لە سەرتاسەری جیهاندا بەبوون هێناوە.

ئەڤێستا لە سەرەتای پەیدابونیەوە، تاکو کۆتایی ساسانیەکان چەند نوسخە بوە، کە هەر یەکە لە گۆشەیەك و پەرستگایەکدا پارێزگاری لی‌کراوە. بەلام قورئان لە گەمارۆی پەرستگا و کەنیسە و میحراب و مەلا و حکومەتێکی تایبەتی‌دا نیە، لەژێر دەستی سەرجەمدایە. هەر خێزانێك نوسخەیەکی هەیە، کەم و زۆر دەیخوێنێتەوە. پەروەردە و فێرکردن لە ئیسلامدا -پێچەوانەی ئایینەکانی تر- تەنها پەیوەست نیە بە روحانی و مەلاکانەوە هەر لە لادێ زاوێك توانیویێتی لەناو جەرگەی بیابانەوە، بۆ گەورەترینی قوتابخانە زانستیەکان و بەرزترین خوێندنگاکان بێت و، لە

خزمەتی ناودارترین زانایان و شارەزایانی مێژودا، دەرس بخوێنێ، بێ ئـەوەی پێویستی بە ناونوس و نیزامی ئەرك و ناسنامە و دەفتەرنوس-واتــە بـەردە زلەکانی سەر ڕێ- هەبێ. هەر لەبەر ئەمەشە کە قورئان لــە نێـوان نەتـەوە دەرس خوێن و پەروەردەخوازدا بــەخێرایی بـڵاو دەبێتــەوە و فـراوان دەبـێ. سەرەڕای ئەم فراوانی و بەربڵاوییــەی، نـەتوانراوە زەڕڕەیـەك لـە حـەرەمی سنوری ببەزێنن، بەڵام بــۆ قەڵــەمڕەو و تـێڕوانین و شـێوەی دیدگـا و بـیری موسوڵمانان، بەرانبەر تــەوحید و گــەورەیی و بـەها و ئەرزشـی قوتابخانــەی ئایینەکــەیان ڕێ دەدۆزنــەوە و تێدەکۆشــن و سـنور دەبـەزێنن. بـۆ ئـەوەی پەڕاوەکەیان بخرێتە پەراوێز و دەســتیان لێ نـەدرێ و، ناسـینیان بەرانبــەر کەسایەتیە ئایینیەکان ئەوانــەی، کـە هێنـدە جێگـەی سـپاس و ڕێـزن لـە گەورەیاندا، دەخرێتە بــەر پەرسـتش؛ لـەناو بچـێ. ئیـتر موسـوڵمانان ئـەو کەسایەتیانە نەناسن و ڕوداوە گەورەکانی، کــە مێـژوی ئایینەکـەیانی پێـك هێناوە فەرامۆش دەکەن.

واتە دەستە و حــیزب و بـاندە تایبەتیـەکان و، دەســەڵاتدارە فریوکـار و خاوەنـانی زێــڕ و زیــو و زۆردارەکــان، دوژمنــانی دەرەوە و ئــێرەیی و چەوتیەکانی ناوخۆیی، هەموو دەستیان بــە دەسـتی یـەك داوە، بـۆ ئـەوەی پەڕاوی ڕوناك و مێژوی دیار و بەرهەمی ئەم ئایینە، کە هەرکەس دەتوانێت بە ئاسانی بیکاتەوە و بیخوێنێتەوە. ئەو کەسایەتیانەی، کە جیــهان گشـتی دەیاننـاسێ، ئەمان بەو شێوە ترســناکە بیانشـێوێنن و بیـان سـڕنەوە. ئایـا ئێسـتا دادپەروەرانەیــە، کــە کەسـێك لەســەر بناغــەی ئـەم سـیما ســڕاوە ترسناکانە و گوتەکانی ئەم باندانە، ئیسلام بناسێ و بناسێنێ؟

دیسانەوە ئایا دادپەروەرانەیە، کە لەسەر بنەمای ئەو بەرهەمانــەی، کـە ساسانیەکانی خۆپەرست و ساختەچی و، روحانیە هاودەســت و نێژراوەکـانی خۆیان ئەو مرۆڤـە وەحشـیانەی، کـە لـە رۆژێکـدا بـە هـەزاران ئێرانیـان کوشت- بە بوونیـان هێنـاوە و، بـۆ ئەڤێسـتای زەردەشـتیان زیـاد کـردوە، ئـایینی زەردەشـت دادگـایی و مـەحکوم بکـەین؟ کاتـێ سـەفەویەکان و مەلاکانی پەیوەست بە حکومەتەکەیانەوە، لە ئیسلام و تەوحید و ئیمامەت و عەلی و چاوەڕوانی و قوتابخانــەی ئـەهلی بـەیت، ئـاوا روخسـار و دیمـەن گەلێك دەسازێنن، کاتێ مێژوی ئاشکرا و رابەر و سەروەرانی دیار و نـاودار و روناکی ئیسـلام کـە ئەوروپیـەکان لـە ئێمـە چاکـتر دەیانناسـن و ئـەو بەرهەمانەی لەسەریان دەنوسن زۆر لە بەرهەمی ئێمە چاکتر و باشـتر- ئـەو هەمو چەوتی و ناڕاستیەیان بدەنە پاڵ و تێکەڵ بکەن؟ لە رۆژگـارێکدا، کـە خەت و پەڕاو و نوسین، بونیان نەبوە و دین زۆر بــە ئاسـانی و سـادەیی لـە سەرجەم لایەنەکانەوە، دەبوە کەرەسەی دەســتی دەسـەڵاتدار و بـەرژەوەندی خوازان. چۆن دەگونجێ ساسـانیەکان سـەفەویەکانی سـەردەمی کـۆن- و روحانیەکان، ئایینێکیان بە پاکی و دەست لێنــەدراو هێشـتبێتەوە؟ لەسـەر بنەمای ساختەکاری روحانیەکانی ساسانی، چـۆن زەردەشـت بناسـین، چـۆن دەکرێ لەبارەیەوە داوەری بکەین؟ ئایا ئەمە جۆرێك لە خۆ گێل کردن و خـۆ هەڵخەڵەتاندن نیە، یان بە هەقیقەتێك کە بوونی هەبوە و فریودانی ئیتر لـەم بارەیەوە، خیانەت کـردن نیـە؟ بـە تایبـەت بـەو ڕادەیـەی، کـە نـاوەرۆکی (وەندیداد) پێکەنیناوی و ترسناکە. ئـەو کتێبانەشـی کـە لەلایـەن سـەرۆك موغەکانـەوە، وەك پـەڕاوێکی کـەلامی سـەبارەت بـە ئـایینی زەردەشـت نوسـراون، هـەروا چـەوت و ترسـناکن. لـە (گاتـــەکان)دا رەگ و ریشـــەی

تەوحیدێکی سازگار وهەستێکی پەرستشی زۆر بالاّ و گوفتاری عاشقانەی روحی کە دژی سەردەمی خۆی و ئایینی خراپ و دارماوی رۆژگاری خۆی و، دژی جیهانێك کە لە شێوەی (شرك)دا بەسەر خەلّکدا سەپێنراوە، راپەڕاوە و دەبینرێ.

## روحانیە رەسمیەکان، پارێزەرانی کرۆکی ئایینی کۆن

بە گوتەی یەکێك لە خۆرهەلاّتناسان، هەر لە سەرەتاوە جگە لە سۆمەر و ئەکاد، واتە باشوری (بین النهرین) لە ئاسیای ناوەند -تەنانەت لە ئێران و هندستانیش دا- پەراوی ئایینی و بەرهەمی گەورەی مەزهەبی، نەدەنوسرانەوە. روحانیە رەسمیەکان نەریتیان وابو، کە ئایات و دروشم و دەقە پیرۆزەکانیان لەبەر دەکرد و، لە بۆنە ئایینی و ڕێ و ڕەسم و لەکاتی نوێژە گشتیەکاندا دەبو بیانخوێندایە. هەر بۆیە لەبەرکردن بە یەکێك لە توانا تایبەتیەکانی روحانی بە ئەژمار دەهات. گەورەترین نیشانەی کەسایەتی ئایینی و روحانی بوون و زانستی کەسەکە، لەبەربوونی دەقە پیرۆزەکان بوو. گەورەترین گوناهیش بە هەلّە خوێندنەوەی دەقێکی -تەنانەت زمان گرتنێکیش- بوو، چونکە دروشمە پیرۆزەکانیان بەبەشێك لە زاتی خوا دادەنا و دەیانگوت، هەر کەس بە هەلّە بیخوێنێتەوە، ئیهانەی بە زاتی خوا کردوە. ئێستاش وەها باوەڕێك لەنێوان ئێمەش دا هەر هەیە، کە ئەگەر کەسێك بە هەلّە قورئان بخوێنێ -بە نموونە- لێی بدرێ! کە ئەمەش بۆتە

هۆی ئەوەی، کە زۆرێك توخنی نەکەون بۆوەی توشــی بەهەڵــە خوێندنــەوە و دارکاری نەبن.[1]

## سوننەتە بۆماوەکان

ئەمانە سوننەت گەلێکن، کە لــە باووباپـیرانی پێـش ئیســلامبونمان بـە میرات ماوەتەوە و، ئاوێتەی بیروباوەڕی ئیسلامان کــردووە، کـە مرۆڤێکــی ئازا و چاونەترس و بێبــاك و هەقیقــەت ناســی دەوێــت، بــۆ ئــەوەی ڕەگ و ڕیشەی ئەم بیروبــاوەڕە چەوتانــە -کــە لەلایــەن عــەوام و لــە کــانونی بـیرو ئەندێشــەکانی زەردەشــتیەکانەوە، کەوتۆتــە نــاو فەرهــەنگی ئیســلامەوە- بدۆزێتەوە، کە لەنێوان ئەم مەعجونە حەوت جۆشیەدا، ئەو گەوهەرە بــەنرخ و مەزنانەی مرۆڤایەتی دەربێنێ و ڕزگاریان بکات و ڕزگارمــان بکــات. لــە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی ئیسلام، چەندە لەو سەرچاوە پــاکژ و زوڵاڵــە دور دەکەوینەوە، ئەوەندەش لە بنەما یەکەمینــەکانمان دێینــە خــوارەوە و درز و کەلێنە نائیسلامیەکان نەك تەنها کەم نابنەوە، بەڵکو زۆرتر دەبــن. چونکــە لــە ســەرەتادا ئەگــەر بتویســتایە ڕیوایــەتێك بگەیــەنی، دەبوایــە زنجــیرەی سەنەدەکەت بزانیبایە، کاتێ دەتتوانــی فەرمودەیــەك بگوازیتــەوە، کــە لــە موجتەهید و مێژونوسێکی گەورە پەیمان نامەت هەبوایە. بەڵام ئەمڕۆکە بــۆ شــوفێری ڕوخســەت نامــە پێویســتە، کــەچی بــۆ گــەیاندنی فــەرمودە و

(١) دیــارە مەبەســتی د.عــەلی شــەریعەتی لــە لێــدان، بــۆ ئــەو قوتابیانەیــە، کــە لەلایــەن مەلاکانەوە لەکاتی بەهەڵە خوێندنەوە لە قوتابیەکان بــدرێ، بــۆ ئــەوەی جــارێکی تــر هەڵــە نەکەن. ئەگینا لە ئیسلام دا هیچ دەقێك نیە لەسەر لێدانی ئەوانەی، قورئان بەبەبێ مەبەســت بەهەڵەدەخوێننەوە.. [illegible]

بیروباوەڕەکانی ئاین و دەقە پیرۆزەکان، تەنــها کـەمێك توانـای ئارایشـتی و ڕازاندنەوە و دیکۆر بەسە!

خۆشـبەختانە بـەناوبانگترین بەشـی (ئاڤێسـتا) هەیــە، بۆیــە دەڵێــم خۆشبەختانە، چونکە بەوەی کە هەیە بڕوام پێیەتی و لەو باوەڕەدام، کـە لـە هەر لایەنێکەوە لە پلەیەکی بالآدایە. ئیتر بۆ بترسم کە بیروڕاکانم ڕو لە ڕوی بیروڕاکانی تر بێ؟ بۆ خۆشحاڵ نەبم کــە نـاوەڕۆکی بنـەماکانی ئـایینێك ئایینێکی وەها، کە تاکو ئێستاش بۆ کۆمەڵە ڕۆشەنبیرێك(!) مایەی سەرنج دان و لێکۆڵینەوەیە- لەبەردەستایە و دەتوانم بــەو بەڵگانـەی کـە ڕاسـت و جێی گومان نین، ڕاڤــە و شـی بکەمــەوە و بیخەمــە بەردەسـت؟ کـە لـەو بڕوایەدام بە جێی ڕوبەڕوبونەوە و تێچونی کات و گرتنی کار و لێکۆڵینــەوە و خوێندنەوە، بۆ نەفی کردنی هەر دەستە و تاقمێك، دەبێ پەیڕەو و دروشــم و بنەما واقعی و سەرەکیەکانی ئەو گرۆ و تاقمانــە، بـە خـەت و ئـەندازەی دانـراوی خۆیــان، چـاپ و بـڵاو بکەینـەوە. ئـەوکات هـەر کـەس پـــەڕاوە دانراوەکانی ئەو تاقمانە بکاتەوە، بە نمونە ئەمەی تیا بخوێنێتەوە، کە هــەر میوە و هێلکەیەك لە خوراســانەوە بێـت، خواردنــی حەرامــە. دەبــێ وەهــا کەسانێك شێت و سەرلێشێواو بن کە بڕوایان بە وەها کتێبێك هـــەبێ. هــەر کـاتێکیش ڕێگـری لــە چـاپ و بڵاوبونــەوەی پـەڕاوێك دەکـەین، خـاوەن و هەوادارانی ئەو پەڕاوە، دروشمە گرنــگ و خاڵــە ســەرنج ڕاکێشــەکان، لـەناو خەڵکیدا بڵاو دەکەنەوە. وا لە هەندێ کەس دەکەن، کە بڕوایان پــێ بکــەن، گەرچی هەڵە و چەوتیشی تیا بێت. لێگەڕێ، پێش ئەوەی ئەوان دەســت بــە وەها کردەوەیەك بکەن، تۆ دەست پێشخەر و، بڕوات بە ئازادی فکر هەبێ و لە سەری بدوێ. هەروا بیخەرە بــەرچاوی گشـتی بـۆ ئـەوەی هەقیقەتـەکان

دیارین و کەس گومڕا نەکرێ، هەروەك چۆن ئەمڕۆکە ڕۆشنبیران، ئێمەیان خستۆتە ژێر کاریگەری هەڵبژاردە مەزهەبی و فیرقەکانیانەوە. هاواریان کرد کە (بەداخەوە موسوڵمانان هاتن و سەرجەم کتێبخانەکانیان لەناوبرد و، پەڕاوەکان نەمان و ناوەکانیش ون بوون)! لە دونیادا مێشکی خەڵکیان داشۆری و موسوڵمانانیان تاوانبارکرد، کە هەرچی بیردەکەینەوە و هاوار دەکەین کەس بە هانامانەوە نایەت، جگە لە (بۆزۆرگمێهری حەکیم) نەبێ. خۆشبەختانە لە سەدەی هەژدەهەمەوە سەرجەم ئەو بەرهەم و نوسخانەی، کە بونیان هەبو -بە تایبەتی هی فەرهەنگی پەهلەوی و ئاڤێستایی و زەردەشتی- کۆیان کردەوە و، هەر وەك خۆی ڕاست و دروست وەریان گێڕا؛ ئەوان پەڕاوەکانی ئاڤێستایی و پەهلەوی ئەشکانی و پەهلەوی ساسانیەکانیان بە وردی خوێندەوە و، بۆ زمانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و هۆڵەندی وەریان گێڕا. ئیتر لەوانیشەوە بۆ سەر زمانی فارسی وەرگێڕدران و، ئاکامەکەشی (داخ و ئاخمان هەموو ئەمەبوو، کە بۆچی لەناوچوون، ئێستاش ئەوانەی ماون بۆ لەناونەچوون و بۆ ماون!).

بە هەرحاڵ ناوەرۆکی سەرەکی و دروستکراوەکانیشی هەیە و دەتوانین دابەش و لێکۆڵینەوە و بەراوردی بکەین. من تەنیا خاڵە سەرەکیەکان کە لەو پەڕاوەدا هەیە، ڕێز دەکەم و دەیگەیەنم و دەڵێم: بەشەکانی تری وەك عیبادەتەکان و کردار و بیروباوەڕەکانی تریان، بۆ خۆتان جێ دەهێڵم و دەتوانن لە پەڕاوەکانیان دا بیانبینن.

## ئایینی زەردەشت و ڕێڕەوی زەردەشتی

هەروەك چۆن ڕێڕەوی شیعە دوو جۆرە، یەکیان شیعەی (عەلەوی) و ئەویتریش شیعەی (صەفەوی)، ئایینی زەردەشتیش دوو ڕێڕەوە: یەکەمیان ئایینێکە، کە زەردەشت هێناویەتی، ئەوەکەی تری ڕێڕەوێکە، کە جێنشینانی زەردەشت -دەسەلاتدار و موبەدەکان- دروستیان کردوە.

خۆرهەلاتناسانی خۆرئاوایی، خۆیان ئەم دو ڕێڕەوەیان لەلا ڕونە، کە هەندێ جار (زۆر ئەستەریسم) دەلێن و مەبەستیشیان لێی ڕێڕەوی زەردەشتی‌یە، هەندێ کاتیش (زۆرئەستەریسم)، کە مەبەستیان پێی ئایینی زەردەشتە.

(زۆرئەستەریسم)، یان ئایینی زەردەشت کۆمەلە بەلگەیەکە، کە دەتوانێ ڕاستیەکان بۆ سیمای هەقیقی زەردەشت نزیك بکاتەوە. هەرچی (زۆر ئەستەریسم)ە، ئەوە زیادکراوە بۆ پەڕاوی ئەوێستا و (دینکرد)ە. وەك سەرجەم پەڕاوەکانی تری زەردەشتی، کە بە درێژایی مێژو پێش ئیسلام و تەنانەت دوای هاتنی ئیسلامیش لە سەدەکانی پێنج و شەش، تاکو سەدەی نۆ لەلایەن پێشەواکانی ئەو ئایینە -واتە ئایینی زەردەشت- نوسراون. لە زەردەشت و سیما و روخساری ئەسلی ئەو، ئەوەندەی گوتم هیچی تر نازانم. ئەوەی ئێستاش باسی دەکەم لە ڕێڕەوی زەردەشتیەوەیە و بەس.

## بناغەی چینەکان

هەروەك لە باسی ئایینی (ڤیدایی)دا گوتم، کە پلەی خواکان لەسەر بنەمای چینە کۆمەلایەتیەکان دابەش دەبون، کۆلەکەکانیشیان لەسەر

بناغـەی تـێڕوانینی ئـایینی و فەلسـەفی پێـك دەهێنـا. لـە مەزهـەبی زەردەشتیش دا، هەر بە هەمان چەشن پلەوپایـەکان ژێـر پەیکـەری ئـایینی پەیدا دەکەن.

لەباسـی (کۆمەڵگەناسـی شـیرك)دا، لـە کۆلیـژی ئـەدەبیات و زانسـتە مرۆڤایەتیەکانی تاران، لـە باسـی (میعـاد بـا ابراهیـم) لـە (حوسـەینیەی ئیرشاد) گوتم: لە کۆمەڵگەناسی شیرك دا، چەندخوایی ژێر بینای فکری بـوە بۆ ئاراستە کردنی ژێربینای کۆمەڵایەتی. چونکە چـەند خوایـی بـەم واتایـە دێ، کە چەند دەستەیەك، چـەند نـەژاد و چـەند تـاقمێك لـە کۆمـەڵگادا، دیاردەیەکی جیهانی، سروشتی، خوایی، ئەزەلی و جێگیریان پـەیدا دەکـرد، کە دابەش بوونی مرۆڤەکانیش بۆ گەورە و بچـوك، بـەرز و نـزم، ئاراسـتەی خوایی بوونیان وەردەگرت. بەرهەڵستی و ڕاپەڕین دژی شیرك، ڕوبەڕو بونەوە لەگەڵ چەند پەیکەرێکی بتی دەستکرد نیـیـە، کـە کۆمـەڵێکی خورافـی و سەرلێشێواو بەخوایان دادەنێن. باشە کەواتە مرۆڤێکی زانا و بیرمەند تـێ دەگەیاندن، کە بتەکان خوا نین، ئیتر کەسیش وا خەیاڵ ناکات. هەر پێگوتـن نا بەڵکو دەبێ ئیـبراهیم ئاسـا، ژێـر پەیکـەری شـیرك لـە ڕەگ و ریشـەوە هەڵبکەنێ و دژی بجەنگێ.

چینەکان لە ئایینی زەردەشـتیدا، بـە چەشـنی خـێرای ئـایینی ڤـەدایی دابـەش نـەکراوە، بـەڵام وردەوردە بـەو حاڵـە، پلەبـەندی کۆمەڵایـەتی پەیکەربەندی ئیلاهی وەرگرتوە.

لە ئایینی هندی و ئێرانی دا -پێش دابەش بوون- دو خوا بوونی هـەبوە: یەکیان (وارونا- ڤارونا) خوای ئاسمان، دوەم (میترا) خـوای خۆشەویسـتی و ڕەحمەت و سۆز و مێهرەبانی و خوای زەوی. (ڤارونـا) هێمـای حکومـەت و

دەسەڵاتدارانی کۆمەڵگەیە و (میترا) -لە ئاوێستادا بە (میـثرە)، کـە هـەر (مێهرە) ناوی هاتوە- خوای مەلاکان و روحانی و موبەد و موغەکانە.

ئەم دو خوایە پێوەندی و هاویەکی نێوان (موبەد) و (پادشا-کیسرا)، یان (ڕاجە -پێشەوا) و (بەرەهمەن)ی دەسەڵاتی کاریگەری ئـایینی و دەسـەڵاتی سیاسی لە هیندستان دا ئاماژە پێدەدەن.

لە شوێنێکی تردا یەکەم (ئەگنی)یە واتە خوای ئاگر. لە خـوای ئـاگریش دوو خودا دروست دەبێت، یەکیان (مێهر) یان (میترا)یە، دووەمی (ڤارونا). لەمەوە دەردەکەوێ، کــە هـەردوو دەسـەڵاتی سیاسـی و ئـایینی لـە یـەك سەرچاوەوە هاتون کە ئەویش (ئەگنی)یە.

لەجێگەیـەکی تـردا لـەجیاتی ئـەوەی بوتـرێ (میـترا) و (ڤارونـا) لــە بەڕێوەبردنی جیهان دا پێکەوە و هاودەسـتن، کـەچی تێکـەڵ دەکرێـن و بـە (میتراڤارونا) یان (ڤارونامیترا) بانگ دەکرێن، کە جۆرێـك ئاوێتـەی یـەکتر کراون، وا هەست دەکەی هەر یەکن.

کەواتە پەیوەندی و هاوڕەگەزی و تەنانەت هاوزاتی و هـاو چارەنوسـی و هاویـەکی ئـەم دو خوایـە، سـەرچاوەی دو دەسـەڵاتی سیاسـی و ئـایینی دەسەڵاتدار پیشان دەدات.

خوای سێیەم (ئیندرا)یە، کـە خـوای جـەنگ و قارەمانـان و پاڵـەوان و سەرکردە و سوپا و پیاوماقوڵانە، (خاوەنانی ئەسپ و شمشێرن).

سەرنج بدەن، جیهان چەندە بە ئاگایانە دابەش بوە! (میترا) زەوی بـەڕێوە دەبات و (ڤارونا) ئاسمان -بە واتای دەسـەڵاتی بـالا- و (ئینـدرا) لـەنێوانی زەوی و ئاسماندایە. واتە دەسەڵاتی شمشێری فیوداڵـی نێـوان دو جەمسـەری ڕەسمی دین و دونیا، نێـوان دەسـەڵاتێك، کـە بـەناوی ئایینـەوە حکومـەت

دەکات -مەلا و شێخ و روحانەکان-، یان هەر ناوێکی تر کــە لیێ دەنێــن. هێزێك کە بەناوی سیاسەت، یان ئابوری، یان هەر ناوێکی تری کە هەیە، لە تێکۆشان و جم وجوڵ دابوە و هەندێ کات کەرەسەی دەستی ئەم بوە، هەندێ کات کەرەسەی دەستی ئەو و هەندێ کــاتیش ئــەمی کــردوە بــە کەرەســەی دەستی خۆیی و هەندێ کاتیش ئەوی دەستەمۆ کردوە.

چوارەمین خودا، خودای جوتیار و کشتیارەکانە، کە سەوزایەکانی جیــهان دەخولقێنێ.

## ڕاتــــۆ

(میــترا) و (ڤارونــا) پــارێزەری (ڕاتــۆ)ن، (ڕاتــۆ) واتــە نــیزام و یاســای گەردون، واتە ڕێك و پێکی. ڕێکخستن لە مێژودا، بریتی بوە لەو پەیوەندیــە کۆمەڵایەتیانەی، کە بەهۆی ئایینەوە پیرۆزمەندی پەیدا کــردوە. بــۆ ئــەوەی هەرکەس و لایەنێك لەو ڕێکخســتن و چوارچێوەیــەدا، حســابی کــاری خــۆی بزانێ و، هەر کەس و توێژێك پلەی خۆی لە ژیــانی کۆمەڵایــەتیدا بناســێ و سەرەڕۆیی نەکات.

ڕێکخستن -یان یاسا، داد، دادگــەریکردن، یــان بــە مانــا فراوانەکــەی، ئەوەی کە خوای (ڕاتۆ) هێما و وێنەکەیەتی- جۆرێکە لــە پلەبــەندی چــین و توێژە مرۆییەکانی کۆمەڵگا، پــارێزەرانی ئــەم چــین و لایەنانــەش (ڕاتــۆ)، خوای (میهر) و خوای (ڤارونا)یە.

دەبینین ئەو هەموو خوا درۆیانە، کە لە بناغــەدا نــین، بــەڵام لای ئــەوان چەندە راست و هەقیقەت و بونیان هەیە، دەگونجێت و بە کەڵکی لێکۆڵینەوە دێن.

ئەم پلەبەندی و قۆناغ کردنی خودایانە -کە دیدگا و تێڕوانینی پلەبەندی کۆمەڵایەتیشە- لە سەردەمی ساسانیەکاندا شێوەیەکی تر لەخۆ دەگرێ. زەردەشت لە سەرەتادا هەموو خواکانی فڕێدابون، لە یەك خـوای بێهاوتـا، کە (ئاهورامەزدا)یە ناوی بردبو. خوای هەژار و خوای دەوڵەمەند، پێشەوا و گەل -هەموو شتێك-، تەنها یەك پەروەردگارە، کە ناوی (ئاهورامەزدا)یـە. بەڵام موبەدەکان، خوای تاقانەی زەردەشتیان کردە دو خوای بەڕێزی گـەورە. ئەوان گوتیان زەردەشـت خـۆی فەرمویـەتی: ئـاگر رەمـز و هێمایەکـە، لـە جیهانی مەلەکوتی (ئاهورایی)، دەبێ ئاگر بە پاك بزانین و رێزی بگریـن.[1] ئیتر موبەدەکان، ئاگر -رەمز و نیشانەی ئاهورا-یان کردە سێ بەش و، سـێ ئاگریان لێ داگیرساند: یەکیان لـە حـەوزی (فـارس)، کـە ئـاگری روحـان و پێشەواکان بو، دوەم لە ئازەربایجان، کە ئاگری شازادە و جەنگ خـوازان بـو، سێهەم ئاوریش (رێوەند-رەوەند) کە هی جوتیار و کشتیارەکان بو.

ئا ئەمەیە کە موبەدەکان -واتە پێشەوا و سەرۆك موغەکان- ژێر بینـای (شرك)یان بۆ تـەوحیدی زەردەشـت دانـا، ئەمـەش کارامەییـەکی سـەیر و سەرسوڕهێنەرە. ئەو پێغەمبەرەی کە شیرکی لەناوبردبو، لـە بەرانبـەر ئـەم شیرکە مۆنتاژکراوەی بەرگی (تـەوحید)، نـەیتوانی کـارێك بکـات.[2] ئـەو شیرکەی کە (عەلی) لە بەرانبەریدا شکستی خوارد و بوە قوربانی. سـەرجەم

---

(١) ئێستاش بنکەی پەرستنی زەردەشتیەکان، کە لەناو شاری تاران دایە هەر ئـاگری تیـادا داگیرساوە. ئەوان رۆژانە پێنج جار نوێژ دەکەن و ڕو لەو ئاگرە دەکەن، کە دایـان گیرسـاندوە. ئەوان بڕوایان وایە، کە ئاگرەکە نوری (ئاهورامەزدا)یە. -وەرگێڕ-

(٢) واتە هەر لەسـەرەتاوە نـەیتوانی لـە رەگ و ریشـەوە هەڵیبکـەنێ بـۆ ئـەوەی مـەودای تەشەنەکردن و لق و پۆپ دەرکردنی نەبێ. -وەرگێڕ-

رابەر و پێشەواکان لـەم لایەنـەی دوەمــەدان، کـە لـە بەرانبـەر ئـەم جـۆرە شیرکانەدا هەست بـە لاوازی و نـائومێدی دەکـەن، چونکـە روبەڕوبونـەوە و لابردنی ئەم (شیرك)ە زۆر ئالۆز و گرانە.

## پایەی روحانیەت

پلەی (موبەد) پایەکی میراتی بوو، مەلازادە گەر چاك یان خـراپ بوایـە هەر دەبوە جێنشینی باوکی، دەبوایە بۆ ئەم پیشەیەی تەنیا هـەندێ یاسـا و ڕێسا و جولان و ڕێ و ڕەسم گەلێك فێر بێت.

بۆ بــوون بــە مــەلا، یــان بــە روحــان دەرهــاتن و لەبــەرکردنی پۆشــاکی روحانیەتی زەردەشتی، پێویست بە زانســتی ناسـینی ئـاین ناکـات؛ تەنـها دەبێ ڕێ و ڕەسمە ئالۆزەکانی نەزر و قوربانی و، هەندێ نەریتی گشتی بزانێ و، گوێی لەبەرکردنی دوعاکانی هەبێ و بەس.

بۆیە لەم ئایینە و ئایینەکانی تری وەك (بــودا) و (یــەهود) و (مەسـیح) و...هتد، روحانی یان قەشە یان بەرەهمەن-روحانی هینـدی- یـان حاخـام و یاریدەدەرەکانیان، کەسـانێك نـین کـە ئایینەکـەیان وەك ئـایینێکی جیـهان بینی، ئایدۆلۆژی و فەلسەفی بناسن و ویژدانیان بۆ هەقیقەت و واقعیـەت و، ڕوی ئایینەکەیان زۆرە و پێشەوا و مەلای گەورەن، بەلام دەست و قاچیان سوکە! نور و رونـاکی روخسـار و پیرۆزیـان هەیـە، بـەلام خوێنـدەوار نـین، ئەمەش لایان سادەیە! بە گوتەی (یارۆ) قەیچێکە مـادام لایەنـەکانی تـرت هەیە، کەواتە بیستم مەدەیێ، نۆزدەم پێ بدە، تەواو گەردنم ئـازاد کردیـت! ئا لێرەدایە، کە دەتوانین بەراوردێك بکەین و ئەرزش و بـەهاکانی ئیسـلامان بۆ دەربکەوێ. بەم واتایە، کە ئیسلام، بەجێی روحانیەت زانست دەناسـێ و

قورئان لەسەر ژێربێژی و تێڕوانینی دیـــن پـــێ دادەگـرێ. واتــە هۆشـیاری و زانایـیی و رۆشنایی و بەویژدانی و ناســینی راســت و دروسـتی دیـن وەك و خۆی. (فقه)یش واتە ئایینناسی؛ تەنیا تێگەیشتن و فــێربونی رێ و ڕەسـم و ئـەحکام و یاسـا و رێسـاگەلێکی یـاد و بۆنـە ئایینیـەکانی وەك یاسـای میرات، قوربانی، یان نوێژە هەمـــەجۆرەکان و... هتـد- نیـە، کـە ئەمانـە هەموو کەس دەتوانێ فێریان بێت. بەڵام ناسینی ئەو هەستە بـە ئاگایانـە و سروشت و تێگەیشتنی دروستی ئاین و ناســینی و رێنمویـی بـەرەو لایەنـە سەرەکیەکان، کە ئایینی لەسەر دامەزراوەو(فقه)ی پـــێ دەڵێـن، کـە کـاری هەموو کەسێکیش نیە.

لە ئایینی زەردەشت دا هەر توێژێك خوایەکی تایبەتی هەیە! روحانیەکان خوایەکی روحانیان هەیە! من کە لە پلەیەکی ترم نە مافی هاتنە دەرەوەم لە چینەکەی خۆم هەیە، نە مافی چوونــە نـاو توێژێکـی تـر. تـەوحید، واتـای ڕوخاندن و لـەناوبردنی ئـەم دیـوارە چـین چـین و توێـژە خـاکی و خوێنـی و تاقمانەیە.

## زەردەشت پێغەمبەرێکی راست و ئافێستاش پەڕاوێکی ئاسمانی

یەشتەکان، سرودەکانی (تەوحید) -کە دەڵێن زەردەشت خـۆی گوتونـی- کە هەندێ کەس لەگەڵ وشەی (یاسین) لــە قورئـان دا بـە یـەکیان دەزانـن، چونکە ئەم وشەیە خوێندنەوەی هەمـــەجۆری هەیـە و بەشـێوەی (یەشمـە) و

(یەشما) و (یەسن) و (یەسنا)ش نوسراوە،[1] هەندێ ریوایەتم لە (بحار) و هەندێکی ترم لە بەرێز ئاغای (تەباتەبائی) -لە تەفسیری المیزان- کۆکردۆتەوە، کە پرسیاریان لە پێشەوا عەلیﷺ کرد، کە ئایا: ئاگرپەرستەکان(مجوس) ئەهلی کتێب بوون یان نا؟ بۆ پێنج و پەنا لە وەلاّم دا دەڵێ: کە ئاگرپەرستەکان ئەهلی پەڕاون و پێغەمبەرێکیان هەبوو، کە کوشتیان و پەڕاوەکەیان سوتاند... هەردوو روداوەکەش لە مێژودا تۆمارکراوە، کە زەردەشت لە شۆڕشێکدا بەدەستی تۆرانیەکان کوژرا و، (ئەڤێستا)ش بە دەستی ئەسکەندەر سوتێنرا.

لە ریوایەتێکی تردا ئیمام عەلیﷺ دەڵێت: پەڕاوەکەی زەردەشت لەسەر پێستی دوانزە هەزار پێستی گا نوسرا بوو.. -خۆرهەلاّت ناسان و مێژوی ئاینی زەردەشتیش هەر وا دەڵێن و دەنوسن-، تا وای لێهات، پادشاکەیان گوناهێکی کرد و لەلایەن روحانە ئاینناسە راستەکانەوە، کەوتە بەر شەپۆلی گازەندە و نارەزایی. ئاکام پادشاش لە رقاندا پەڕاوەکەی نابود کرد و ئەحکام و یاساکانی ئاینی زەردەشتی لەبەین برد و، بەم شێوازەی ئێستای لێکرد..

لێرەدا ئیمام عەلیﷺ لەرێ‌لادانی ئاینی زەردەشت ئاوا شی دەکاتەوە کە: ئاینێك بوە خاوەنی پەڕاو و پەیام و هەق، کە بە دەستی دەسەلاّتدار و بەرژەوەندی خوازانی چاوچنۆك و ملهوڕ لە مێژودا، لە پەیمانی سەرەکی خۆی لادراوە و دەستکاری کراوە.

(١) یەشتەکان سرود و هاوار و راز و نیازە لە ستایشی ئەیەزدان، کە رەگی (ئەیەزد)یش (یەزد)ە و (یەسنا) و (یەشت) و (یەزدان)یش سەرجەمیان رەگی هاوبەشی (یەزد)یان هەیە، کە بە واتای پەرستش و ستایش دێ.

(حجر)-لەباشوری یەمەن- شوێنی دانیشـــتوانی ئێرانیـە زەردەشـتیەکان بـوو. دوای رزگـارکردنی یەمـەن لەلایـەن موسـوڵمانانەوە، بـە فـــەرمانی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئاگرپەرستەکان، واتە زەردەشتیەکانی (حیجر) هەڵس و کەوتی ئەهلی کتێبیان لەگەڵ کردن و (جزیە)یان لیْ وەرگرتن. دەشـزانین کـە ئیسلام، تەنیا لە یەکخواناسان و لەو گەلانەی، کە ئەهلی کتێـب و ئـایینی راستێتی تەوحیدی بوون، گــەرچی دەریشـچوبن و توشـی لادان و چـەوتیش بوبێتن، جزیە وەردەگرێ. بۆیە پێغەمبەرﷺ شیرکی مەجوس هەروەك شیرکی یەهود و مەسیحیەت دەبینێ، ئایینی زەردەشـــت خـۆی بـە ئـایینی شـیرك نازانێ، بەڵکو مەجوسەکان بە موشریکی ئاین دادەنێ.

## (ئاهورامەزدا) خوایەکی دورو دەست پێنەگەیشتو

لـە رێـرەوی زەردەشـتیدا (ئاهورامـەزدا) خوایـەکی زۆر گەورەیـە، کـە دەستی مرۆڤە ئاسـاییەکانی پـێ ناگـات و، نـاتوانی لـەو نزیـك بیتـەوە و (توسل)ی پێ بکەی، بیپەرستی و راستەوخۆ شتێکی لیْ داوا بکـەی. ئـەوە ئەیەزدان و خوا بچوکەکانن، کـە لەبەردەسـت دان و وەڵامگـۆی نیازەکـانی خەڵکن. بۆیە پەرستگاکان هــی ئەمانەیـە: هـی (سـروش) هـی (ئـاگنی)، (ناهید) و (مێهر) و (میترا)یە، هەر بۆیە لە چیا بڵندەکـان دا لـە بەرانبـەر خۆردا، بە پەرستشی خوداوە خەریك دەبـون. بـەڵام ئـەو پەرسـتگایەی کـە بنیاتیان دەنـا، بـۆ پەرسـتنی (ئاهورامـەزدا) نـەبو، بـەڵکو بـۆ پەرسـتنی ئەیەزدانەکان و کردنیان بە (واسیتە) و پلە بـۆ گەیشـتن بـە (ئاهورامـەزدا) بوو.

# الله خودایەکی نزیك، ئێستاش چەندە دور

دیسانەوە عەوامەکانی ئێمە لەژێر کاریگەریەکانی ئاینی زەردەشتیدا دەرنەچون، لەم بوارەش دا زۆربەی کەسایەتیە ئاینیەکانیش لە خزمەتی ویست و هەست و حەزەکانی ئەواندان نەك هی الله.

لە نزیك مەشهەد، گڵکۆی کەسێك هەیە بە ناوی (خواجەمراد)، کە کەس نازانێ کێیە. هەندێ بە نۆکەری ئیمامی دادەنێن -ئیمام رەزا-، هەندێکی تر بە هاورێ و موریدی. بەشێکی تریشیان دەڵێن رەوانەکراو و سیخوری خەلیفە بوە، دەستی لە کوشتنی ئیمام دا هەبوە. بڵێین چی هەرچی و هەرکێیە لەم سنورە تێ ناپەرێ. بەڵام تێرامان لەمەدایە کە مەشهەدی مەزهەبی، چونکە نیاز و پێداویستیەك، لە شەوانی جومعە و رۆژە پیرۆزەکانی تردا ئەو هەموو رێگایە دەروا و گڵ دەخوات بۆ ئەوەی بگاتە زیارەتی خواجەمراد و داواکەی لە بەرانبەردا بکات، لەکاتێك دا بەسە بۆی هەر کە لەماڵ هاتەدەر بچێتە بارەگای (ئیمام رەزا). نزیکتر لە ئەمیش ئەوەندەی بەسە لە ماڵەکەی خۆیدا (الله)ی ئیسلام بانگ بکات. بەس گەل چی بکات، کە نیزامی (بەرێز و بەگەورەزانین)ی کەسایەتیەکان لە دیدگا ئاینیەکانیشیدا رەنگی داوەتەوە و خۆی لە بەرانبەر بارەگای ئیمام رەزا و کەسایەتی بەرێزی ئەودا، بەشوان دەبینێ و، وا هەست دەکات کە مافی چونە ناو کۆشکی ئەوی نیە!؟

بۆیە لەجیاتی چونە لای سەرۆك و مودیر، دەچێتە لای کارمەند و فەراش و خزمەتکارەکان، واتە لەجیاتی روکردنە خوا رو لە (خواجەمراد) دەکا. لەکاتێك دا لە ئیسلام دا ئیسلامێك کە هەبو- خوا دۆست و نازناوەکەشی

((الی الرفیق الاعلی)) بو، هاوڕێیەك، كە لە قورئان دا بە چەشنێك لەگـەڵ بەندەكانی قسە دەكات، كە هەست دەكەی هاوڕێی مرۆڤە و، دەبێ دۆسـتی بیت بۆ ئەوەی دۆستت بێت.

لەكاتی فەرماندانیش دا بەجیات ئەوەی وەك (یهوە)[1] پێـت بڵـێ: بـڕۆ! مەڕۆ! بكە! مەكە! بەڵگەت بۆ دەهێنێتەوە و لە كۆتایشـدا بەرهـەمی ئـەم حوكـم و بەڵگانـەت بـۆ دەردەكـەوێ، كـە چ ئاكـامێكی بەسـودی لێ دەكەوێتـەوە. ئەمـەش ئەوپـەڕی خۆشەویسـتی و نزیكـی پـەروەردگار و بەندەكانیەتی. لە دوایدایە كەسایەتیە ئایینیەكان لە هۆشماندا جێگـای خـوا دەگرن و لە ئەندێشەماندا قۆناغ بەندی و پلەیان بۆ دادەنرێ. هەموو ئەمانە تێڕوانینەكانی پێش ئیسلامە، كە دێتە ناو ئیسلامەوە و هاتوە.

## پەرستنی هەرچی چاكە، نەك پەرستنی خودا

پەرستش لە ئیسلامدا تایبەتمەند كـراوە بـۆ خـودا ((إیـاك نعبـد وإیـاك نستعین)) -هەر تۆ دەپەرستین و یارمەتیش هەر لە تـۆ داوا دەكـەین-، كـە بێ هاوتایە و، ئێمەش یەكخواناس. بەڵام لە ئایینی زەردەشـت دا سـەرەڕای ئەوەی، كە خوا یەكە، بەڵام پەرستش و داواكردنی یارمەتی تەنـها تایبـەت نیە بە خوا، بەڵكو هەرچی چاك و جوان و سودمەند و بەڕێزە، دەپەرسـترێ. سەرجەم بەشەكانی (یەشتەكان) ستایش و پەرستشی هەموو شتە باشـەكانی (ئاهورا)ن، تەنانەت مانگا و ئاگریش بۆ نمونە.

---

(١) یهوە: ئەو ناوەیە كە لە تەورات دا بۆ هاوار كردن بۆ خوا بەكاریان هێنـاوە. لـە پـەڕاوی یەهود دا، خوا كوڕی هەیە (عوزەیر كوڕی (یهوە)یە .. قورئان دەفـەرموێ: ((وقـالت الیـهود عزیر ابن الله...))سورە التوبە/٢٩ (وەرگێڕ)

بەلاّم لە (گاتەکان)، واتە گوتەکانی زەردەشت خۆیدا، دەردەکەوێ کە (ئۆردیبەهەشت، خورداد، ئیسپەند) -ناوەکانی ئەمشاسپەندەکان- سیفاتی (ئاهورامەزدا)ن، نەك ناوە تایبەتیەکانی ئەو. بەلاّم لەدوای بەشی (گاتەکان)ەوە، ئەم سیفاتانە لە وەسف بۆکراو، واتە (ئاهورامەزدا) جوێ دەبنەوە و، شێوازی کەسایەتی و ئەیەزدان و فریشتەی نزیك لە خوا وەردەگرن. چونکە ئەمانە سیفاتی (واجب الوجود) و زاتی ئەزەلی و جاویدانی و نەمری (خودا)ن، کە جیاش دەبنەوە، دەبنە فریشتەی سەربەخۆ. ئیتر لایان نەمری و هەمیشەیی خۆیان بە چەشنی (ئاهورامەزدا) دەپارێزن، لێرەدا ئاشکرایە، کە ئەمە شیرکە.

## خواکانی تر

لە ئایینی زەردەشتیدا، جگە لە ئەمشاسپەندەکان، خوای تریش هەیە، لەوانە:

١-سروش: هێمای گوێڕایەڵی و پارێزکاری(تقوی) و پەرستشە و، هێمای روحانیەکانیشە، کە بانگخوازانی گوێڕایەڵ و پەرستنی خوا لە زەویدان.

٢-فەرەئەیزەد: گیانێکی پیرۆزە، کە پیت و بەرەکەت و پاکی و پیرۆزی دەهێنێ، بچێتە هەر گیان و لاشەیەك، سەرکەوتن مسۆگەر دەکات. بە عافیەت و سەلامەت، یان پلە و تەخت و دەسەلاّت دەگات، رزگاری دنیا و پاشەڕۆژیش مسۆگەر دەکات.

بە ڕاز و نیاز و پەرستشی (ئاهورامەزدا)، دەتوانی (فەرەئەیزەدی) دەست بخەیت. فەرەئەیزەدی ئەگەر بچێتە گیانی هەرکەسێکەوە، ئەوە ئەو گیانە خۆشبەخت دەبێ، ئەگەر نەچێت ئەوە بێبەخت دەبێ.

٣-مەنتەر[1]، ئەو وشەیەی کە ئێستاش هەر ماوە، دەڵێن (مەنتەرکراوە) یان (مەنتەریان کردوە)!

مەنتەر بریتی بوە لە وشە و رستە و دەقە پیرۆز و وێرد و پاڕانەوەکان، کە دەبوایە بە زمان و دەم و پۆشاك و دەست و قاچی پاك و خاوێنەوە بخوێندرایە. یان هەندێ کات و بۆنە و ڕێ و ڕەسمی تایبەتی ئاینی و روحانی بوو، کە دەبوایە لەلایەنی پێشەوای رەسمیەوە بە دەنگ و ئاهەنگی تایبەتیەوە پێشکەش بکرایە.. ئەم وشانە، بە وشە (ئاهورا)ی‌یە نهێنیەکان دەزانران، کە لە دەرونیاندا (مانا) و روحی نهێنی و شاراوەیان هەبوو. کاتێ لە رێگەی گوێوە بۆ روح و دڵی بیسەر دەچو، ئەو کارەی دەکرد کە نان و شەرابی پیرۆزکراو لە خواردنەوەی (ربّانی) مەسیحیەت دا، دەیکات. دوپات کردنەوەی ئەم وشە پیرۆز و نهێنیانە، پاداشتی هەیە و پڕ بەهایە، گەرچی ماناکەشی نەزانی. گوتنی ئەم وشە و ئاساوێردانە -نەك خوێندنەوەی وەکو دەقێك بۆ تێگەیشتن- بەرهەم بەخشە و پاکێتی غەیب و نادیاری هەیە و زیاد لە شایستەی کەسەکە -لە دونیا و دوارۆژدا- پاداشت دەدرێتەوە. ببینن ئەمانە چەند لەو پاداشت و مژدانە دەچن، کە لە پەراوێزی دوعاکانی ئێمەدا دەنوسرێن. لەکاتێکدا کە قورئان و دوعاکانی ئیسلامی هێندە بایەخ دار و بەئەرزشن، کە پێویستیان بە پاداشت نیە، چونکە بۆ سیستەمی ژیانن. بە نمونە (زیارەت و میرات) هەرکەسێك بیانخوێنێت، ئاگایی و گەورەیی و بەرێزی دەست دەکەوێ و، جیهانبینی و فەلسەفەی مێژویی

(١) مەنتەر: رامکردن، دەستەمۆکردن، هێنانەژێربار، هەروەها بەو توانا ئەفسوناویەیە دەڵێن، کە بۆ رام کردن و دەستەمۆکردنی دڕندە و حەیوانات بەکاری دەهێنن. -وەرگێڕ- سەرچاوە/ فرهنگ فارسی عمید.

پەیدا دەکات، دەگاتە ئاستێك، کە هەموو شتێکی لا رون دەبێت. نـەك وەك ئەوەی بەرزکردنەوەی ئەو ورە و هەستە مرۆیە بێنێ و، بلێی هەرکەس ئەم دوعایە سێجار لە رۆژێکدا روەو رِوگە بخوێنێ، حەفتا هەزار حـۆری بەسـەر یەکەوە لە گیرفانی دەرێژن! -ئاخر ئـەم هـەموەم بـۆ چیـە؟- یـان ئەگـەر تاوانەکانی بە ئەندازەی کەفی دەریا و تۆزی بیابان و ئەستێرەی ئاسمان بێـت پاك دەبێتەوە! الله اکبر، ئەگەر ئادەمیزاد تەمەنی نوحیشی هـەبێت و بـۆ ساتێکیش بێتاوان و گوناە هەڵ نەکات، هەر تاوان کەم دێنێ!-، باشە ئـەم وشانە چ بەرهەمێکی جادوییان هەیە، کـە لـە گـەردون و ژیـاندا، هێنـدە کاریگـەری جـێدەهێڵن، {کـە ئەگـەر وابـێ} تـەرازوی دادپـەروەری پەروەردگاریش لەکار دەخەن!؟

## قیامەت لە ئایینی زەردەشتیدا

باوەڕبوون بە رستاخێز(قیامەت) لەو بەڵگە بەرایانەی کە لەسەر ئـایینی زەردەشت هەمانە بوونی نیە، بەلام لە سـەنەدەکانی سـەردەمی ساسـانی -کۆتایی ئەو ئیمپراتۆرە- سەرهەڵدەدات. من هەست دەکەم و، وای بۆ دەچـم کە مەسەلەی رستاخێز و پاشەڕۆژ و دابـەش بوونـی دونیـا، بـۆ (گێتـی) و (مینۆ) -واتە جیهانی دونیا و پاشەڕۆژ- و دوای ئەمیش مەسەلەی تـەرازو و دۆزەخ و بەهەشت و مەسەلەکانی تـری وەك یاسـاغ کردنـی هاوسـەرگیری لەگەڵ خزمان، لە ئایینی زەردەشتی کۆندا هەبوبێت. -گەرچی لـەوە دەچـێ لە رێڕەوی زەردەشت دا بوونی نەبووبێت، بەلام لە دواییدا بەهۆی پەیوەندیان بـە فەرهـەنگی ئیسـرائیلی و، فەرهـەنگی ئاریـەکانی (بـین النـهرین-میزوپۆتامیـا) و، فەرهـەنگی ئیسـلامیەوە، وردەوردە سـەری هـەڵدابێ.

ئەمەش دروست پێچەوانەی گوتەی خۆرهەڵات ناسەکانە، کە دەیانــەوێ بــە فریوکــاری و ســاختەکاری ســەیر، مێــژوی لــەدایك بوونــی زەردەشــت لـــە (٣٢٩)وە بــۆ (٦٠٠)ی پێــش زایــین، یــان (٦٠٠٠) ســاڵ پێــش هێرشـــی ئەسکەندەر، بگەڕێننەوە، بۆ ئەوەی بە ئاکامێکی نژادی بگەن! بۆ؟ چونکـــە ئەوروپیەکان هەر جۆرە ئاین و مەزهەب و مەکتەبێك، کە بوونیان هەبێ- بە گیانێکی خۆپەرستانە (ئێگۆتیزم Egotism)انە بیر دەکەنەوە و خۆیان بە سەرچاوە و خاوەن و هۆکاری بوونی هــەر دیــن و مەکتــەب و فەلســەفەیەك دەزانن. ئەمەیە کە لەو پەڕاوانەی بۆ منداڵەکان (تەنانەت زانکۆیەکانیشمان) دەینوسن سەرجەم زانســت و فەلســەفە و ئەندێشــە و ئاکــار و رەوشــتەکان، هەموو دانایی و هونەریەکان لە یۆنان و ئاتنەوە سەرهەڵدەدەن و لــە پــاریس یان لەندەن -واتە خۆرهەڵاتناسان هی کوێی ئەوروپا بن- کۆتاییان دێ.

لەم بارەیەوە هەڵە نەکەن، کە هەندێ لە خۆرهــەڵات ناســەکان، کــە-بــۆ نموونە- لەسەر (ئەبو عەلی سینا) دەنوسن و دەڵێن: ئەو زانایــەکی گــەورەی بێوێنە بوو. یان ئیسلام بۆ یەکەمجار فلاّن مەسەلەی گەورەی بە بوون هێناوە یان کحول(الکُل) (رازی) دۆزیوەیەتیــەوە، یــان تیشــك دانــەوە (ابــن هیثــم) یەکەمجار سەلماندویەتی، بیرکاری (عومەری خەییام) دایهێناوە.

ئەمانە لە پەڕاوەکانی قوتابخانە ئەوروپیەکاندا نیە، مامۆستایانی زانکۆ، بــانگخوازان، وتــەبێژان و نوســەران ئەمانـــە نــاڵێن، بـــەڵکو ژمارەیـــەك خۆرهەڵاتناسی گۆشەگیر و دور لە فەرهەنگ و پەروەردە و فێرکردنی ڕەسمــی و دور لە زانکۆ و مامۆستاکان، کە لە ئەوروپادا هەن ئەمانـــە دەڵێــن -کــە هەندێ جار لە زانکۆیەکدا یان وڵاتێك دا بە پەنجــەی دەســت دەژمــێردرێن)، کە لەژێر کاریگەریەکانی تایبەتمەندی تایبەتی کەسێتی خۆیاندا، ئاکامگیری

هەڵە دەکەن. هەشیانە دادپەروەرانە لەژێر کاریگەری خۆرهەڵات و فەلسەفە و ئاین و ئاکار و هونەر و...هتد. خۆرهەڵات دان و راستیەکان وەك خۆیان دەڵێن و هەندێکیشیان ئەو راسپاردەیان بەگوێدا چرپاوە -کە شوتیەك بخەنە بن باخەڵمانەوە- (زۆریش سوپاسی ناوێ!)، بەلام فەرهەنگی ئەوروپا -چ (هیگڵ) بێ، یان (ئەرنست رینان)، یان (زیگمۆند فرۆید) و چ...هتد. بێت- خۆپەرستانەیە (ئێگۆتیزم)ە. چ بەو چەشنەی کە یۆنان بە بناغە دادەنێن و، ئیتران بە بەربەر و وەحشی و نەزان، چ بەم شێوەی ئێستا، کە ئەوروپا بە رەسەن و ژیاری ئادەمی و ئادەمیزادەکانی‌تر بە خێوەت نشین و خۆرهەڵاتی و ئیحساساتی دەزانن و لە هەر بوارێکەوە ئەوروپا دواکەوتوێ بە هەوڵێکی بێ وچان ساختەچیانە، پێشی دەخەن و مرۆڤە پێشکەوتەکانی تری، جگە لە خۆیان بۆ دواوە دەگەڕێننەوە.

بەلام لە مەسەلەی تەوحید دا -کە شانازییەکە لە شانازیەکانی گەورەی مێژوی ئاینەکان و پێشکەوتوی ئەندێشەی ئادەمی- دەبینین، کە کۆسپیان لەبەردەم هەیە. کێشەکەش ئەمەیە، کە ئەوروپیەکان لە بەرانبەر خۆرئاوادا، خۆرهەڵات بە گچکە تەماشا دەکەن. ئەم تێڕوانینەیان بۆ خۆرهەڵات وای کردوە نژادی سامی بچوك بێ، ئاریەکان، عەرەبەکان، تورك، مەغۆل، چینی و هندیەکان، سەرجەمیان -وەك نژادی دەستی دوو- تەماشا بکرێن.

ئەمرۆکەش جیهانبینی خۆرئاوا، جیاوازە لە جیهانبینی سەدەی نۆزدە. ئەو جیهان بینیە تەنگەی، کە دونیا لە ئەوروپاوە بۆ یۆنان و، لە یۆنانەوە بۆ ئەوروپا کورت دەکاتەوە. بەلام هەر ئەو زانست خوازە ئەوروپیە کاتێ بۆ ئێران، ئیسلام، هندوستان و...هتد. دێ، دەبینێ کە سەردەمانێ

باووباپیرانی ئەوان زمانیان نـــەپژابوو(!) لـێرەدا شارســتانێتی و فەرهــەنگی گەورە و باڵا هەبوە.

کـە تەماشـای مێـژوی نـەژادەکان دەکـەن، بۆتـان دەردەکـــەوێ، کـــە (ئـاری)یـەکان -لـێرەدا مەبەسـت ئـێرانی و هندیـەکانن- دوای ســـامی و ئارامیەکانی (بین النهرین) بە بــەراوردکردنیان لـە بەرانبــەر ئاریــە بــەڕێز و پێشکەوتوو سەبەتە پڕ لە گوڵی سەر سەری مرۆڤایەتی، ئەو نـــەژادەی، کـە بە گوتەی (هیگڵ) ((تەنانەت خواوەند بۆ گەیشتن بــە خۆئاگـایی پێویسـتی پێیان هەیـە))! نـەژادێکی بەکـەم زانـراو و نزمــە. گـەرچی گەیشتبێتیشـە تەوحید و گەورەترین پێغەمبەریش، کە لەنێوان ئاریەکانی ئێران و هندســتان دا سەری هەڵداوە زەردەشتە، کە دەتوانرێ بە یــەکتاناس بزانـرێ. هــەروەها دامـەزرێنەری قوتابخانەی دیار و ناوداری تەوحید، کە تەوری هەڵگرتوە و، لە پەرستگادا، یەك بە یەکی بتەکانی تێك و پێـــك شـکاندوە ئیبراهیمــە، کـە دەگەڕێتــەوە بـۆ (١٨٠٠) ســاڵی پێـش لـەدایك بوونــی (مەسـیح). واتــە (١٢٠٠) ساڵ پێش لـــە دایـك بوونـی زەردەشـت. (کۆنفۆشـیۆس و بـودا و مهاویرا و نانك و...هتد.) ناتوانرێ هیچ کامیـــان بــە یــەکتاناس بناسـرێ. تەنیا زەردەشتە، کە لە ڕوانگەی نەژادەوە دەتوانین بیخەینە پاڵ ئـەوان و بــە یەکتاناسی بزانین.

دوای ئیبراهیم، موسا و عیسا و پێغەمبەری ئیسلام -هەر لەو زنجیرەیــە هاتون (زنجیرەی تەوحید)[1] کە ئیبراهیم و موسا پێش زەردەشت بوون.

(١) وەرگێڕ

کەواتە خۆرئاواییەکان چی بکەن؟ دەبێ بۆ زەردەشت -گەورەیی تەمەن- وەربگرن! هەر بۆیە ئەویان هەشت هەزار و دوو سەد ساڵ بۆ ڕابردو گەڕاندۆتەوە بۆ ئەوەی شانازی تەوحید لە نەژادی (سامی) بگرن و، بە نەژادی ئاریای خۆیان (ئەوروپا)ی ببەخشن!

پ/ تۆ لە بارەی زەردەشتەوە تەنیا دو خاڵت باس کرد، ئەویش ئەوەیە، کە یەکتاناس بووە و (ئاهورامەزدا)ی هێناوە. دەی کەوایە ئەی ئەو هەموو خوایانە و دروستکردنی ئەو هەموەی تر و ئەنجامدانی ئەو هەموو ئەرك و فرمانە لە بەرانبەریاندا بۆچی بوە. ئەگەر زیادکراوە بۆی، زەردەشت سەبارەت بەمە چی گوتوە، بێجگە لەم دوانە چی دروست کردوە؟ هەروەها تۆ ناوی ئەو هەموو خوایانەی (ئەڤێستا)ت گوت، ئنجا فەرموت زەردەشت هات و گوتی: ئاهورامەزدا خوای گەورەیە و بەس. ئایا ئەم خوا جۆراوجۆرانە لەپێش زەردەشت دا هەبون -کە زەردەشت ئاهورامەزدای کردۆتە جێگەیان- یان لە دوایدا بە بوون هاتون؟

وەڵام/ سەرجەم ئەو خوا هەمەجۆرانە لە پێش زەردەشت دا هەبوون، بەڵام بەشێوەیەك، کە هەریەکەیان زاتێکی سەربەخۆ بوون و، پلەو پایەی گەورە و بچوکیان هەبوو. ئەو کارەی زەردەشت کردی ئەمە بوو، کە خوای کردە بەدیهێنەر. (ئاهورامەزدا) و سەرجەم خواکانی تری ئاریەکان، کە لە پێش راپەڕینی خۆیشیدا هەر هەبوون بە چەشنێك ئاراستە کرد، کە لەگەڵ نیزامی تەوحید دا پێچەوانە و دژ نەبێت. ئەمە چۆن چۆنی؟ بەم چەشنەی کە بوونی زاتی هەندێ لەو خواوەندانەی وەك -ئەبجێکتیف- (دیار و بەرچاو)(١) ئینکار کرد و گوتی: کە ئەوانە بوونیان نیە، بەڵکو ئەوانە سیفاتی

---

(١) وەرگێڕ

(ئاهورامەزدا)ن. بۆ نموونە ئێمە ئێستا (الله)مان هەیە و دوایــش (رحمــن) و (رحیم) و (جبّار)مان هەیە. لە کۆن دا -پێش زەردەشت- (رزاق) خوای رزق و رۆزی بوو، (رحمــن) خــوای رەحمــەت و بەخشــندەیی بــوو، (جبــار) خــوای گــەورەیی و جەبــەروت و دەســەڵات بــوو، (خـــالق) خـــوای بەدیـــهێنان و ئافەریدگار بو. خوا بە واتای پەرســـتراوی هەرەگــەورە، خوایــەکی تــر بــوو، هەموو ئەمانە خوای لە یەك جیاواز و سەربەخۆ بون. بەڵام زەردەشت هـــات و گوتی: (ئاهورامەزدا) یەکێکــە و خوایــەکمان نیــە نــاوی (الــرزاق) بێــت، (رزاق) سیفەتی (ئاهورامەزدا)یە. خوایەك نیە ناوی (خلّاق) بێــت، (خــلّاق) سیفەتی (ئاهورامەزدا) خۆیەتی؛ بۆیــە ئەمشاســپەندەکان -کــە خورتــات و ئۆردیبەهەشت و فەروەردین و ...هتد. و وەهومــەن بــن- فریشــتە و خــوای جیــاواز و ســەربەخۆ لــە (ئاهورامــەزدا) نــین، بـــەڵکو ئەوانـــە ســیفاتی (ئاهورامەزدا) خۆنی.

دووەم: ئەیەزدانەکان بوون، کــە ئــەمانیش لــە پێــش زەردەشــت دا هــەر هەبون، لەپاڵ (ئاهورامەزدا)دا بە خوا بچوکەکان دەزانران، بــەڵام زەردەشــت (ئاهورامەزدا)ی لە سەرو هەموویانەوە دانا و سەرجەمی ئــەو خوایانــەی بــە ژێردەستە و عەبد و دروستکراوی خوای گەورە -واتە ئاهورامەزدا-ی دانـــا. بەم چەشنە بە پەســـندکردنی ئـەو خـوا جیاوازانـەی ئـایینی شـیرکی کۆنـی ئاریەکان و بە گۆڕانی زنجیرەی پلە و پایەکان و پەیوەندی نێوانیان، تەوحیدی بیناکرد. هەروەك چۆن ئێستا لە تەوحیدی ئێمەدا هەیــە، کــە بڕوامــان بــەو فریشتانە هەیە، کە لە جیهاندا هەن و، هــەر یەکەشــیان بەرپرســی ئــەرك و کارێکن لە گەردون دا -بەڵام بە فرمانی خوا کار دەکەن و کارگێڕ و ئیرادە و ویستی ئەون و بەبێ ئەو هیــچ ویســت و ئیرادەیــەکیان نیــە و دروســتکراوی

خوای گەورە خۆیەتی- کە هیچ زیانێك بە تەوحید ناگەیەنێ. ئەگەر بمانەوێ بە زمانێکی ئیسلامی قسە بکەین، ئەوە دەبێ بڵێین: زەردەشت خواکانی (ئاری)یەکانی لە بەرانبەر (ئاهورامەزدا)دا، کردە فریشتە کە لەژێر دەسەڵاتی (ئاهورامەزدا) خۆیدان و، جێبەجێکاری فرمان و یستی ئەون و لەلایەن ئەویشەوە بەدیهێنراون.

# ناوەڕۆك



لەبارەی (یەك خوا بوون)ی، یان (دوو خوا بوون)ی خوای زەردەشت، دوو بۆچون هەیە: یەکێکیان ئەو ڕوانگە کلاسیکیەیە، کە زەردەشتیە ئاساییەکان (نەك ئەوانەی، کە ئاراستەکاری باسەکەن) بروایان پێی هەیە لە دیدگای ئەمانەوە، ئایینی زەردەشت، ئایینی دوو خوا پەرستیە، ڕێرەوی خوای (ئاهورا) و خواکەی تریش (ئەهریمەن). ئایینی (انگرمئی نو) و (سپنتامئی نو) و دو زاتی (خێر) و (شەر)، هەر کەسێ -هەرچی- ناپاك و خراپ و بەدە، (انگرمئی نو)ە، ئەگەر چاکە و پاکە و باشە ئەوە (سپنتامئی نو)ە. ئەم دوو زاتە -(انگرمئی نو) و (سپنتامئی نو)- بەردەوام لە بەرانبەرکێ و بەرهەلستی یەکتردان، بۆیە ڕێرەوی زەردەشت باوەڕی بە دو زات هەیە لە جیهاندا.

ڕوانگەی دووەم: هی ئەو مێژوونووس و نوسەرە تازانەیە، کە کاریان ڕازاندنەوە و زیندوکردنەوەی ئایینی زەردەشتە، ئەوانەی کە دەبینن مێشك و هۆشی ئەمڕۆی مرۆی جیهان، یەکتایی بوونی خوا دەناسێ و دانی پیادادەنێ و ڕێزی لی دەگرێ و دەشی پەرستێ. تەنانەت بێ مەزهەبیەکانیش بە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئایینەکانی تردا، دانی پیادا دەنێن، کە (تەوحید بەرزترین بینای تەواو و بێ کەم و کوری ئاگایی ئایینییە) -کە ئەمەش ئاشکرا و گومانی تیادا نییە-. بەڵام ئەمان کە خەریکن بە لێکۆڵینەوە و سەرنج دانی ئایینەکان، هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشن، کە لەو ئایینانە سیما و ڕوخسارێکی تەوحیدی بسازێنن. لەو جۆرە کەسانەش بۆ نمونە: (ڕادهاکریشنان) -نوسەری قووڵ و بەرین، کە لە سۆنگەی ژیربێژی(لوجیکی) ئایینیەوە، یەکێکە لە جێشانازانی جیهانی ئەمڕۆ- دەیەوێت لە ئایینی هیندۆس -سەرەڕای چەند خوا بوونیان- سیمایەکی تاقە خودایی بنەخشێنێ. کە هەوڵ و کۆششی ئەو، شایانی ڕێز و پێزانینە، بەڵام نەك وەك پیشاندان و جوان شیکردنەوەی ئایینی شیرك و بەتەوحید ناساندنی. ئەگەر ئەو بە تەنیا وەك ئایینێکی نوێ بیروراکانی دەخستە ڕوو، زۆر سوپاسمان دەکرد، نەوەك بەم شێوەیە، پێچەوانەی سەرجەم ڕاستی و بەڵگە و هەقیقەتەکان و ئەرشیفەکانی بەردەست بۆ باسکردن و نیشاندانی ئایینی دابنیشێ، گەرچی ڕۆشنبیر هەر جۆر بیەوێت و مەبەستی بێت دەتوانێت باسەکە ئاراستە بکات و بوروژێنێت. کۆچ کردو (دکتۆر موعین)یش، کە پیاوێکی زۆر باش و مەزن بوو، -دەترسا لەوەی، کە زانایان و چاکەکان هەلە بکەن و وتەیەك بە نارەوا و ناهەق بلێن و بنوسن-. بەداخەوە ئەم، خۆشی کەوتە ژێر کاریگەری ئەو بیروبۆچونانەوە، کە ئایینی زەردەشتی بە یەکتاناسینی خوا پیشان دا، لەکاتێك دا ئایینی زەردەشتی، شیرکی تەواوە -هاوشێوەی ئایینی (ڤەدا) و (میترایسم)، کە ئەویش (ئاهومەزدا) و (ئەهریمەن)ە و ناکۆکی و جەنگی نێوانیان لە جیهان دا تا کۆتاییە. هەروەها لە دیدگای ئایینی زەردەشتیەوە، هەزاران فریشتە و یەزدان و ئەمشاسپەند و کارپان لە جیهان دا بەردەوام لە ناکۆکی و شەر و بەرانبەرکێی یەکتردان. دوبەرەکی و ناتەبایی هەمیشەیی نێوان هەردوو هێزی ئاهورایی و ئەهریمەنی. لە سەرەتای (ئاوێستا)دا چەندین شیعر و سرود هەیە، بەناوی (گاسە) یان (گاتەکان) بە واتای (موقام)، کە ئاهەنگ، یان ئاواز و ڕاز و نیاز دەگرێتەوە -کە زماناسانی وەك (دارمستتەر) پێی وایە ئەم بەشەی (ئاوێستا)، زیاتر لە هەموو بەشەکانی تر نزیکترە لە زمانی زەردەشت خۆیەوە- هەر بەو زمانەی، کە پەراوەکانی (ڤەدای)یان پێ نوسیوە، نوسراوە. بۆیە دەتوانرێ بگوترێ، لە دوو هەزار و سێصەد، دو هەزار و چوارسەد تا پێنج سەد ساڵ لەمەو پێشە. هەندێك بروایان وایە، کە لەوە دەچێ ئەم سرودانە، دوعا و پاڕانەوەکان )ڕاز و نیاز(ی زەردەست خۆی بێت، بەرانبەر بە پەروەردگاری.

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ٥٦٤ ساڵی ٢٠٠٤